# دادگای مێژوو

گفتوگۆی نێوان عەبدوڵڵا ئۆجالان،
ئیبراهیم ئەحمەد و محەمەد ڕەسوڵ هاوار

چاپی دووەم

# دادگای مێژوو

گفتوگۆی نێوان

عەبدوڵلا ئۆجالان، ئیبراهیم ئەحمەد و

محەمەد ڕەسوڵ هاوار

وەرگێڕانی: پاڵە مزوری

ناوی کتێب: دادگای مێژوو
بابەت: گفتوگۆی نێوان (عەبدوڵلا ئۆجالان، ئیبراهیم ئەحمەد و محەمەد ڕەسوڵ هاوار)
وەرگێڕانی: پاڵە مزوری
پێداچوونەوە: لوقمان عەبدوڵلا
دیزاین: گۆران پێنجوێنی
نۆرەی چاپ:
چاپی یەکەم: ٢٠٠٠
چاپی دووەم: ٢٠٢١
تیراژ: ١٠٠٠
چاپخانە:

لە بەڕێوەبەرایەتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردن (       )
ساڵی( ٢٠٢١)ی پێدراوە.

# ناوەڕۆک

**پێشەکی:**

خوێنەری هێژا، ئەم پەرتووکەی لەبەر دەستت دایە دەقی گفتوگۆیەکە لە نێوان ڕێبەر عەبدوڵلا ئۆجالان و هەردوو شادڕەوانان "تێکۆشەر و نووسەر ئیبراهیم ئەحمەد و شاعیر و نووسەر محەمەد ڕەسوڵ هاوار". ئەم دیالۆگە مێژووەکەی بۆ کۆتاییەکانی پاییزی ساڵی ١٩٩٥ دەگەڕێتەوە کە لە ئەکادیمیای کادیرانی پەکەکە لە ڕیفی دیمەشق بەڕێوە چووە.

ئەم گفتوگۆیە لە بنەڕەتدا لە دوو تەوەر پێکهاتووە؛ تەوەرەی یەکەمیان، گفتوگۆیەکی شیکاریی مێژووی سەدەی ڕابردووی جولانەوەی کوردە لە نێوان ڕێبەر ئاپۆ و مامۆستای نەمر ئیبراهیم ئەحمەد. تەوەرەی دووەمیشیان، بە شێوەی پرسیار و وەڵامە لە نێوان ڕێبەر ئۆجالان و شاعیر و نووسەر محەمەد ڕەسوڵ هاوار، کە مامۆستا هاوار دەپرسێ و ڕێبەر ئاپۆش وەڵام دەداتەوە.

تەوەرەی یەکەمی ئەم دیالۆگە؛ کە گفتوگۆی نێوان ڕێبەر ئاپۆ و مامۆستای نەمر ئیبراهیم ئەحمەدە، بۆ جاری یەکەم لە هاوینی ساڵی ١٩٩٧ لە ڕۆژنامەی سەرخۆبوون Serxwebun بڵاوکرایەوە کە ڕۆژنامەیەکی مانگانەیە و لە ئەورووپا بە زمانی تورکی دەردەچێت.

دوای کۆچی دوایی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد، لە لایەک وەک وەفادارییەک بۆ ڕەنج و تێکۆشان و یادی ئەو نەمرە و خستنەڕووی چۆنیەتی پەیوەندی نێوان ڕێبەر ئۆجالان و مامۆستای خوالێخۆشبوو، لە لایەکی تریش بە ئامانجی

سوود بینین و وانە وەرگرتن لە مێژووی ڕابردووی نزیک، لە هاوینی ساڵی ٢٠٠٠ دا بەشێکی ئەم دیالۆگەمان بۆ زمانی کوردی (کرمانجی ناوەڕاست) وەرگێڕا و لە ژێر ناوی "دادگای مێژوو" وەک نامیلکەیەک چاپ و بڵاوکرایەوە. دواتر لە ساڵی ٢٠٠٤ پەرتووکێک لە ژێر ناوی "ئایدنلارلە سۆیلاشی" (گفتوگۆ لەگەڵ ڕۆشنبیران) لە لایەن ڕۆژنامەی سەرخۆبوون چاپ و بڵاوکرایەوە؛ کە هەردوو تەوەری ئەو گفتوگۆیەشی لە خۆوە دەگرت. شانبەشانی ئەم سەرچاوەیەش لەم ماوەیەی دواییدا توانیمان دەقی ئۆرژینالی ئەم دیالۆگە بە دەست بێنین.
لە لایەک بە هۆی داواکاری زۆری خوێنەران و ناوەندە ڕۆشنبیرییەکان بۆ ئەم بەرهەمە، لە لایەکی تریش لەبەر ئەوەی ئەو بەشەی پێشتر چاپ و بڵاوکرابوویەوە، جگە لەوەی تەنیا تەوەرێکی گفتوگۆکە بوو، هەروەها هەندێ کەموکورتیشی هەبوو؛ چونکە بە گوێرەی دۆخی ئەوکاتە و سیاسەتی ڕۆژنامەکە، چەند پەرەگرافێک و چەندین دێڕیشی لێ لابرابوون. هەربۆیە لە لای خۆمانەوە بە پێویستمان زانی سەرلەنوێ وەرگێڕان و پێداچوونەوە بۆ دەقی تەواوی ئەم گفتوگۆیە بکەین.
لەمیانی وەرگێڕان و پێشکەش کردنی ئەم بەرهەمە بە خوێنەرانی هێژا، ئومێدەوارین خزمەتێکمان پێشکەش بە ڕۆشنکردنەوەی زیاتری ئاسۆی تاکی کورد و پەرتووکخانەی کوردی کردبێت.

**وەرگێڕ**

**٤ی نیسانی ٢٠٢١**

## لە مێژوو دەکۆڵینەوە و
## ڕۆشنایی دەخەینە سەر سیاسەتی نیشتیمانی

**ڕێبەر عەبدوڵلا ئۆجالان:** هەڤاڵان، بە ئامادەبوونی ئێوە پێشوازی لە میوانانی هێژا مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد (کەوا لە سەرەتای جوڵانەوەی ڕزگاری نیشتیمانی کورد ڕۆڵێکی گرنگی بینی) و شاعیر و نووسەری گەورە مامۆستا هاوار دەکەین، سڵاویان لێدەکەین و دەڵێین بەخێربێن.

PDK وەک جوڵانەوەیەکی نەتەوەیی و لە سەرەتای دەستپێکردنی جوڵانەوەی کورد، دوای دووەمین جەنگی جیهانی و پێش جەنگیش دەستی پێکرد، بەڵام دواتر لەبەرگەلێک هۆکاری جیاجیا ڕۆڵە گەورەکەی سەرەتای لەدەستدا. لە دوای یەکەمین جەنگی جیهانییەوە، جوڵانەوەی نەتەوەیی - نیشتیمانی کوردستان بەهۆی هەندێ دەرفەتەوە کەوتە ناو قۆناخێکی نوێوە، لەگەڵ تەواوبوونی یەکەمین جەنگی جیهانیش زۆرینەی گەلان لەمیانی پشت بەستن بە شۆڕشی ئۆکتۆبەر دەرفەتی ڕزگاری و ئازادییان بەدەست هێنا. لە دوای هەرەسهێنانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، بەر لە تەواوی گەلانی تر جوڵانەوەی ناسیۆنالیزمی تورک لە ژێر سەرکردایەتی (مستەفا کەمال) سوودێکی زۆریان لە پشتگیریی و هاوکاریەکانی شۆڕشی ئۆکتۆبەر وەرگرت.

لە بنەڕەتدا چەکەرەی جوڵانەوەی کورد لە دەڤەری کۆچگری باکووری کوردستان پێش جوڵانەوەکەی مستەفا کەمال سەریهەڵدا، لە باشووری کوردستانیش ئەو جوڵانەوەیەی بە ڕێبەرایەتی (شێخ مەحمودی بەرزنجی) بوو دژ بە ئیمپریالیزمی ئینگلیزیی سەریهەڵدا. لەو قۆناخەدا هێشتا هیچ جموجۆڵێکی مستەفا کەمال لە ئارادا نەبوو، ئەو زەمینەیەش دەرفەتێکی مەزنی بۆ کوردان ڕەخساندبوو. بەڵام دوای ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و دامەزراندنی کۆماری تورکیا، جوڵانەوەی کورد ڕووبەڕووی گەلێک کێشەی سەخت و دژوار بوویەوە و لە ئارادا نەما. دەکرێ بڵێین؛ لەوکاتەدا بەشێکی کوردان لە چوارچێوەی ڕێکخراوی لە شێوەی (جەمعیەتی تەعالی کورد) ڕێکدەخران. بەڵام لەبەرئەوەی ئەو ڕێکخراوانە لە زۆر لایەنەوە لاواز بوون؛ شانبەشانی لاوازییان لە ڕووی ڕێکخستنیەوە، ئایدیۆلۆژیاکەشیان لەگەڵ سەردەمدا گونجاو نەبوو. هەروەها لایەنی نەتەوەیی و بەشداربوونیشیان زۆر لاوازبوو و تێری نەدەکرد. لە بەرامبەر ئەمەشدا نەتەوەپەرستی و شۆڤێنیزمی کەمالیستەکان زۆر بەهێزبوو و پشتیان بە دەوڵەتێک دەبەست، هەروەها پاشا[1] و والیەکانیش تورک بوون. کاتێک (مستەفا کەمال) لە ڕێگەی پەیوەندیکردن بە هەندێ ئەفسەر و والی دەستی بە جوڵانەوەکە کرد، ئەو کاتە کوردەکان تازە بە تازە

---

[1] پاشا: مەبەستی جەنراڵ و ئەفسەرەکانی سوپای تورکە.

دەهاتنەوە هۆش خۆیان. کۆمەڵە کوردییەکان (بە تایبەتی جەمعیەتی تەعالی کورد) دەیانخواست خۆیان بگەیەننە کوردستان، لەم پێناوەشدا هەندێ هەنگاویان هاویشت.
ئەو سەرهەڵدانانەی بەر لە جوڵانەوەی کەمالیستەکان لە باکووری کوردستان سەریانهەڵدا، دەیانتوانی لە دێرسیم و تەواوی باکووری کوردستان خۆیان بەهێز بکەن. هەروەها ئەو جوڵانەوەیەی بە سەرکردایەتی شێخ مەحمودی بەرزنجی لە باشووری کوردستان دەستی پێکرد لە چوارچێوەی یەکێتی نێوان باکوور – باشووری کوردستان دەیتوانی تەواوی کوردستان بگرێتەوە. لە خۆرهەڵاتیش لە ژێر سەرکردایەتی (ئیسماعیل- سمکۆخان) جوڵانەوەی کورد دەستی پێکرد بوو؛ بەم جۆرەش ئەو جوڵانەوانەی لە هەرسێ پارچەی کوردستان دەستیان پێکرد، تاڕادەیەک لایەنی نەتەوەییان هەبوو، تەنانەت ئامانجی دامەزراندنی دەوڵەتیشیان هەبوو. بەلام لەگەڵ دەرکەوتنی جوڵانەوەی کەمالیستەکان، ئەو هەل و دەرفەتانەی بۆ کوردان ڕەخسا بوو، هێدی هێدی لە دەست چوون. بە مانایەکی تر، ئایدیۆلۆژیا و ڕێکخستنی کەمالیستەکان زۆر لە هی کوردان بەهێزتربوو، لە ڕووی سیاسیشەوە بەهێزتر بوون. هەروەها لە ئەنجامی ڕێککەوتنی ئەنقەرەی سالی ١٩٢٠ ی نێوان فەرەنسا و کەمالیستەکان، باشووری کوردستانیش بە ڕووی کەمالیستەکاندا کرایەوە، لەهەمان قۆناخدا لە ڕوها (ئوڕها- ئورفا) و دیلۆک (عەنتاب)یش جوڵانەوەیەکی

کوردان له ئازادابوو، بەڵام ئەو جموجۆڵەش له دواییدا کەوته ژێر کۆنترۆڵی کەمالیستەکانەوە.
هەروەها له ساڵی ١٩٢١ یشدا ڕێککەوتنێکیان لەگەڵ مۆسکۆ ئیمزاکرد، له ڕێگەی سوود وەرگرتن لەم ڕێککەوتنەش کەمالیستەکان هەردوو شاری قارس و ئەردەهانیان خستە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە. لەو قۆناخەدا جوڵانەوەیەکی شۆڕشگێڕیی به ناوی "شورا" له قارس و ئەردەهان و ئەرزەرۆم هەبوو، ئەو جوڵانەوەیەش کەوتە ژێر کۆنترۆڵی کەمالیستەکانەوە. له هەمان کاتیشدا جوڵانەوەی کورد له باشووری کوردستان به ڕێبەرایەتی (شێخ مەحمود بەرزنجی) له بەرامبەر ئینگلیزەکان سەرکەوتنی گرنگی بەدەست هێنابوو، تەنانەت خۆی کردبوو به دەوڵەتێکیش.
لەو سەردەمەدا پرسی سەرەکی لای ئینگلیزەکان پەترۆڵی ئێراق بوو. هەروەها شان بەشانی ئەمەش بەرامبەر به سۆڤیەت دەیویست ئێراق له ژێر کۆنترۆڵیدا بێت. لەبەر ئەم دوو هۆکارەش ئینگلیزەکان پەیوەندیی خۆیان لەگەڵ کەمالیستەکان بەهێزکرد. هەروەها لەو سەردەمەدا ئینگلیزەکان لەمیانی یاریکردن به جوڵانەوەی کورد و ترساندنی کەمالیستەکان، دەیانویست به لای خۆیاندا پەلکێشیان بکەن. له کاتێکدا کەمالیستەکان به یارمەتیدان و پشتگیری کردنی (شێخ مەحمود) هەڕەشەیان له ئینگلیزەکان دەکرد، ئینگلیزەکانیش ویستوویانە جوڵانەوەی کورد له باکووری کوردستان وەک کارتێکی فشار له

بەرامبەر کەمالیستەکان بەکاربهێنن، بەلام لە کۆتاییدا هەردوولاش پشتگیرییان لە جولانەوەی کورد نەکرد، بەلکو یارییان پێکردن. لە دەرەنجامیشدا کەمالیستەکان پترۆلی موسل و کەرکوکیان بۆ ئینگلیزەکان بەجێهێشت و ئینگلیزەکانیش ئەوەیان پەسەند کرد کە کوردەکان بکەونە ژێر بالادەستی و کۆنترۆلی کەمالیستەکانەوە.

بەم جۆرە لە دەرەنجامی ئەم ڕێککەوتنە، پارچەکردن و دابەشکردنی کوردستان لە بواری کرداریدا بە ئاکام گەیشت، هەروەها ئینگلیزەکان، هەنگاو بە هەنگاو کەمالیستەکانیان خستە ژێر کۆنترۆلی خۆیان، بەمجۆرەش کەمالیستەکان بۆ خزمەت و بەرژەوەندی ئینگلیزەکان بەرامبەر بە سۆڤیەت کەوتنە نێو جموجۆلەوە. دواتریش بۆ پتەوکردن و تۆکمەکردنی ئەو ڕێککەوتنانە هاوپەیمانێتی بەغداد و سەنتۆ پێکهێنران، لە ڕاستیدا ئەم هاوپەیمانێتیانە دژ بە یەکێتی سۆڤیەت و کوردان پێکهێنرابوون.

لەو سەردەمەدا هەندێ پارت و ڕێکخراوی کوردانیش دامەزرێنران، لە ڕێگەی ئەم گفتوگۆیەی لەگەل مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد ئەنجامی دەدەین هەولدەدەین ئەم بابەتانە تاوتوێ بکەین.

پارت و ڕێکخراوە کوردییەکانی ماوەی نێوان سالانی ١٩٢٠-١٩٣٠ چۆن دەرکەوتن و بۆچی ڕۆلی خۆیان نەبینی؟ هۆکاری ئەمە چی بوو؟ لە هەمووشیان گرنگتر ئەوەیە، بۆچی ئەو پارت و ڕێکخراوانە ڕۆلی خۆیان لە کۆماری

کوردستان لە مەهاباد دا نەبینی؟ بۆچی باشووری کوردستان نەبوو بە خاوەن قەوارە و دەوڵەتێک؟ بۆچی یاخیبوونی دێرسیم سەرکوتکرا و شانبەشانی تێکشکانەکەی، بۆچی باکووری کوردستان هەناسەی لەبەر برِا و خنکێنرا؟

ئەو دەسەڵاتە فاشیستەی کە کەمالیستەکان بەسەر باکووری کوردستاندا سەپاندیان کوردەکانی خستبووە ژێر باڵادەستی خۆیەوە. هەروەها لە خۆرهەڵات و باشووری کوردستانیش دۆخێکی هاوشێوەی ئەمە لە ئارادابوو. واتە سیاسەتێکی هاوشێوەی ئەو سیاسەتەی کەمالیستەکان لە نێوان ساڵانی ١٩٣٠-١٩٤٠ لە باکووری کوردستان پیادەیان دەکرد، لە خۆرهەڵات و باشووری کوردستانیش بەرِێوەدەچوو. ئێرانیەکانیش لە ساڵانی ١٩٤٥ تا رِۆژی ئەمرِۆمان سیاسەتێکی هاوشێوە لەسەر خۆرهەڵاتی کوردستان پەیرِەو دەکەن. هەروەها ئەو دەسەڵاتەی لە ئەنجامی شۆرِشی ساڵی ١٩٥٨ و دواتر بوو بە فەرمانرِەوای ئێراق، لە هەندێ لایەنەوە دەسەڵاتێکی هاوشێوەی دەسەڵاتی کەمالیستەکانە.

هەڵبەتە ئەوەی لێرەدا گرنگە، جولانەوەی کورد لەو قۆناخەدا، واتە پەدەکە- ئێران، پەدەکە- ئێراق و پەدەکە- تورکیا بۆچی رِۆڵی خۆیان نەبینی؟ رِێبەرایەتی و سەرکردایەتییان چی بوو؟ ئەمانە بابەتی گرنگن.

له دوای دووه‌مین جه‌نگی جیهانی هه‌ندێ گۆڕانکاریی و جیاوازی که‌وته ناو جوڵانه‌وه‌ی نه‌ته‌وه‌یی کورد، چونکه هه‌ندێ گۆڕانکاریی له ناو کۆمه‌ڵگه‌ی کورددا هاتبووه ئاراوه. کۆمه‌ڵگه‌ی کۆن کۆمه‌ڵگه‌یه‌کی فیودالی و خێڵه‌کی بوو، له‌سه‌ر بنه‌مای ئه‌م پێکهاته‌یه PDK دامه‌زرێنرابوو، کاتێ که کۆمه‌ڵگه‌ی کورده‌واری گۆڕانکاری نوێی به‌خۆیه‌وه بینی، ئیتر چینه‌کانی کرێکار و بۆرژواش ده‌رکه‌وتن. شانبه‌شانی ئه‌م گۆڕانکاریه کۆمه‌لایه‌تییانه له بواری سیاسیش گۆڕانکاری هاوشێوه هاته‌کایه‌وه، به‌لام ده‌بێ ئه‌وه‌ش دیاری بکه‌ین که له پاڵ ئه‌ویشدا پێکهاته‌ی فیودالی - خێلایه‌تی هه‌ر به‌رده‌وام بوو. له ئه‌نجامی ئه‌و گۆڕانکاریانه‌شدا جوڵانه‌وه‌ی کلاسیکی کورد له دوای شه‌سته‌کان، به‌شێوه‌ی دوو پارت خۆی ڕێکخست. یه‌کێکیان نوێنه‌رایه‌تی میللیگه‌رایی سه‌ره‌تایی ده‌کرد و به سه‌رکردایه‌تی مه‌لا مسته‌فا بوو، ئه‌وی تریشیان PDK ی مۆدێرن بوو که ڕێبه‌ره هێژاکه‌ی مامۆستا (ئیبراهیم ئه‌حمه‌د) له ساڵی ١٩٦٤ (ته‌نانه‌ت پێشتریش، له ساڵی ١٩٥٣) به‌دواوه له پێناو گه‌یشتن به سه‌رکه‌وتن ویستی ڕێبازێکی نوێی بۆ دابنێ. له ساڵی ١٩٧٥ یه‌کێتی نیشتیمانی کوردستان دامه‌زرا، هه‌روه‌ها له‌هه‌مان قۆناخدا پارتیا کارکه‌رێن کوردستان PKK له‌دایکبوو و تا ڕۆژگاری ئه‌مڕۆمان درێژه به تێکۆشان و خه‌باتی خۆی ده‌دات.

جوڵانەوەی نەتەوەیی- نیشتیمانی کورد ئێستا بە قۆناخێکی نوێ گەیشتووە. لەگەڵ ڕووخانی یەکێتی سۆڤیەت هاوسەنگیەکانی جیهان و ناوچەکە گۆڕانکاریی بەسەردا هات، هەروەها شەڕی نێوان ئێراق-ئێران هەلومەرجە بابەتیەکانی بۆ کوردان ڕەخساند و پێگەیاند.
بە شێوەیەکی زەق و بەرچاو جوڵانەوەی PKK شۆڕشی لە باکووری کوردستان پەرەپێدا و بەرەو پێشەوەی برد، لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا تێکۆشانێکی بەرفراوان و هەمەلایەن بەڕێوەدەبات، ئیتر جوڵانەوەی نیشتیمانی تا ڕادەیەکی زۆر تێکۆشان و سیاسەتی پەرەپێدا و پێشیخستووە، هەروەها لە باشووری کوردستانیش بە قۆناخێکی گرنگدا تێپەڕ دەبێت.
لە دەرەنجامی تەواوی ئەمانەش دەکرێ بڵێین؛ هەلومەرجە بابەتیەکانی کوردستان تا ڕادەیەک پێگەیشتووە، چونکە وەک ڕابردوو چیتر هاوپەیمانێتی لە جۆری بەغداد و سەنتۆ لە ئارادا نییە و ئەمانە پەرتەوازە بوون و کۆتاییان پێهات؛ ئەمڕۆ ناکۆکی مەزن لە نێوان ئێران - تورکیا و ئێراق- تورکیا لە ئارادایە. ئیتر ئەمریکاش وەکو جاران کوردان بە کۆمۆنیست لەقەڵەم نادات، چونکە یەکێتی سۆڤیەت پەرتەوازە بووە و هەروەها دەوڵەتە گەورەکانیش وەک جاران هێندە گەمە و یارییەکانیان لەسەر جوڵانەوەی کورد پیادە ناکەن.
تەواوی ئەم فاکتەرانەش هەلومەرج و زەمینەیەکی ئەرێنی دەڕەخسێنن. هەروەها لە ناوخۆش عەشیرەتگەریی و

هزرەکەی و ڕێبەرایەتیەکەی تا ڕادەیەکی مەزن پاشەکشێیان کردووە و کاریگەرییان کەم کراوەتەوە. لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا سەرکردایەتی بنەماڵەگەریتی بارزانی تەنگەتاوە و زۆر سنووردار کراوە. لە بەرامبەر ئەوەشدا شۆڕشی جولانەوەی نیشتیمانی لەسەر بنەمای ڕێبازی شۆڕشگێڕیی و یەکێتی نەتەوەیی مەزن بووە و پەرەی سەندووە. ئیتر سەرۆکایەتی کۆنی کلاسیکی ڕووبەڕووی لەناوچوون بووەتەوە. بەرامبەر بەمەش ڕێبەرایەتی هاوچەرخ بە هێز و توانایەکی زۆرەوە خۆی سازداوە و لە تەواوی پارچەکانی کوردستان بووە بە داخوازییەک. واتە ئەمڕۆ هەرکەس دەیەوێ لەگەڵ ئەم ڕێبەرایەتییە هەنگاو بنێت. لەمیانی دەستنیشان کردنی ستراتیژیەتێکی بەهێز بۆ ڕزگاریی نیشتیمانی دەکرێ ئەمە پیادە بکرێ. لە ڕۆژی ئەمڕۆماندا ستراتیژ و ڕێکخستن هەیە، هەربۆیە یەکێتی نەتەوەیی کوردان لە گەورەبوونی بەردەوام دایە. لە هەندێک پارچەی کوردستاندا کوردان دەتوانن بگەن بە ستاتۆی فیدڕاڵی. ئەمە شیاوە و لەجێگای خۆیدایە، ئامادەکاریەکانمان لەسەر ئەو بنەمایەیە و تێکۆشانیش بەخێرایی تاودەسێنێ و بەردەوامە. لە پێناو گەیشتن بە ستاتۆی فیدڕاسیۆنی- نەتەوەیی لە باکوور و باشوور و خۆرهەلات ڕۆڵی خۆمان دەبینین. هەربۆیە گرنگە کە بیرکردنەوەکان لەسەر بنەمایەکی تەنگ و سنووردار یاخود بەگوێرەی بەرژەوەندییە تاکگەرا و ئارەزوومەندییەکان

نەبێت. بەڵکو لەم ڕۆژانەدا پێویستە هزراندنمان مەزن بێت و لە ڕێگەی سیاسی و یەکێتیدا ڕۆڵ ببینین. ئێمە تا دوایی ئامادەین.

لێرە لەگەڵ مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد و هاوڕێ هاوار دا هەوڵدەدەین گفتوگۆ سەبارەت بەم خاڵانە بکەین کە بە کورتی ئاماژەمان پێکردن. لەو بڕوایەدام کە بە شێوەیەکی قووڵ و بەرفراوان ئەم بابەتانە لە ڕووی سیاسییەوە ڕوون دەکەنەوە. هەروەها لەو بڕوایەدام کە ڕۆشنکردنەوەی ئەم بابەتانە و تیشک خستنە سەریان تەنیا بۆ کادیران و ئەندامانی خولی پەروەردەیی ئەکادیمیای مەعسوم قۆرقماز پێویست نییە، بەڵکو بۆ تەواوی ڕوناکبیرانی کورد و شۆڕشگێڕان و جوڵانەوە شۆڕشگێڕییە نیشتیمانییەکان پێویستییەکە. ئەگەر باش لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو ئەزموونانە بکەین کە دوای دووەمین جەنگی جیهانی هاتنە ئاراوە، ئەوا سەبارەت بە مێژووی کورد و تێکۆشانمان و ڕۆژگاری ئەمڕۆمان دەبێتە سەرچاوەیەکی باشی هێز و وزە. دەشێ مرۆڤ پرسیار لە یەکتریش بکات، بەمجۆرەش لە ڕێگەی لێکۆڵینەوە و لێتوێژینەوەی مێژوو هەوڵدەدەین سیاسەتی نەتەوەیی- نیشتیمانی ڕۆشنبکەینەوە، هەروەها لەهەمان کاتدا دەکرێ بە گرنگییەوە دەسەڵات و سیاسەتی کورد تاوتوێ بکەین.

بەڵێ مامۆستا دەکرێ بە کورتی باسی مێژوو بکەین؛ لە دوای یەکەمین جەنگی جیهانی چانس و بێ چانسی کوردان

چۆن دەرکەوت؟ وەک سەرەتایەک ڕۆشنکردنەوەی ئەم خاڵە پێویستە و لەجێگای خۆیدایە. واتە ئەو دەرفەتانەی بۆ کوردان ڕەخسان چۆن دەرکەوتن و تا چ ڕادەیەک کوردان سوودیان لێوەرگرت؟ هۆکارە خۆیی و دەرەکیەکانی ئەم ڕەوشە چی بوون؟ هەروەها کەمالیزم چۆن پێکهاتووە و چۆن کوشت و بڕ و جینۆسایدیان ئەنجامدا؟ جوڵانەوەکانی کوردستان چۆن سەرکوتکران و بە چ دۆخێکەوە گەیشتنە دووەمین جەنگی جیهانی؟ هەروەها لەو قۆناخەدا ڕۆڵی ئێوە چی بوو؟ لەلایەکی دیکەوە لە دوای دووەمین جەنگی جیهانیدا چۆن و بە چ شێوەیەک PDK دامەزرێنرا؟ بەڵێ مامۆستا ئیبراهیم فەرموو بیر و بۆچوونەکانتان سەبارەت بەم بابەتانە بخەنە ڕوو.

**مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد:** وەک ئاگادارن جوڵانەوەی کورد لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا بە قۆناخێکی هەستیار و گرنگدا تێپەڕ دەبێت، بۆئەوەی نەکەوینەوە ناو هەمان هەڵە و کەموکورتیەکانی مێژووی ڕابردووی کوردستان، پێویستە جارێکی تر لە جوڵانەوەکانی ڕابردووی کوردانەوە دەستپێبکەین.

لەگەڵ دەرکەوتن و سەرهەڵدانی ڕێکخراوی ئیتیحاد و تەرەقی هۆشیاری نەتەوەیی ئەو نەتەوانەی لە چوارچێوەی سنووری ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا دەژیان تا ڕادەیەک پەرەسەندنی بەخۆیەوە بینی. بەمجۆرەش گشت نەتەوەکانی ناو سنووری ئیمپراتۆریەت، لە سەرووی هەمووشیانەوە

کورد و عەرەبەکان ڕێکخراو و کۆمەڵەی تایبەت بە خۆیان دامەزراند. ئەو دەرەنجامانەی لە پرەنسیپی ئەم ڕێکخراوانەش هەڵدەهێنجرێت ئەوەیە: لە سەرەتا ئەم کۆمەڵانە نەیاندەخواست لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی جیاببنەوە، لەجیاتی ئەمەش دروشمی "یەکێتی، ئازادی و یەکسانی" ئیتیحاد و تەرەقییان کردبووە ئامانجی خۆیان. بەڵام ئیتیحاد و تەرەقی دەیخواست نەتەوەکانی تری ناو سنووری ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە خۆوە بگرێت و بیانتوێنێتەوە. هەربۆیە پڕۆگرام و پرەنسیپ و تێکۆشانیان جیاوازبوو. کاتێک کە یەکەمین جەنگی جیهانی دەستی پێکرد، هێشتا دامەزراندنی جوڵانەوەی نەتەوەیی لە تورکیا، لە هەنگاوی یەکەمینی دابوو. جوڵانەوەی کوردیش لە ناو جوڵانەوەکانی ڕزگاریی نیشتیمانیدا، لە ڕووی نەتەوەییەوە لەهەموویان لاوازتربوو. بەڵام لە کاتی یەکەمین جەنگی جیهانیدا کوردەکان لە تورکەکان زیاتر بەرگرییان لە یەکێتی و یەکپارچەیی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دەکرد.

هەمووومان باش دەزانین کە ئەڵمانیا و ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە یەکەمین جەنگی جیهانیدا دووچاری شکست بوون و هاوپەیمانەکان لە شەڕدا سەرکەوتنیان بە دەستهێنا. واتە ئینگلیزەکان و فەڕەنسایییەکان وەک لایەنی سەرکەوتوو لە جەنگدا دەرکەوتن، بێگومان لەو کاتەدا هەندێ ئامانجی ئینگلیزەکان و فەڕەنسایییەکان و ڕووسیا سەبارەت بە خۆرهەڵاتی ناوین و خۆرهەڵات لە ئارادابوو.

بەر لە کۆتایی هاتنی یەکەمین جەنگی جیهانی، ئەم سێ دەوڵەتە ڕێککەوتنیان لە نێوان خۆیاندا مۆر کردبوو. بە گوێرەی ئەو ڕێککەوتنەش دەبووایە ئەو خاکەی ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی کە بە "پیاوە نەخۆشەکە" ناوزەدیان دەکرد، لە نێوان خۆیاندا دابەشی بکەن؛ بە گوێرەی ئەو ڕێککەوتنە کوردستانیشیان دابەش کردبوو. بڕیاری ئەوەیان گرتبوو کە ئەو بەشەی بە ویلایەتی موسڵ ناودەبرێ بە فەڕەنسای بدەن، لەو کاتەدا هەندێ دەرەبەگ و ئاغای کورد ویستیان ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بقۆزنەوە و لە لایەنی نەتەوەییەوە بەکاریبێنن.

شەریف پاشا کە ئەو سەردەمە سەرکردایەتی جوڵانەوەی کوردی دەکرد، نوێنەری کۆنسوڵخانەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بوو لە سویسرا. لەبەر ئەوەی شەریف پاشا ڕەچاوی ئەو واقیعەی کرد کە هاوپەیمانەکان (لایەنی سەرکەوتوو لە جەنگدا) بە هۆی مەسیحی بوونیان زیاتر هاوکاری جوڵانەوەی نەتەوەیی ئەرمەنی دەکەن، ئەویش کەوتە نێو پشتگیریی و کۆمەککردنی جوڵانەوەی ئەرمەنییەکان. بەمجۆرە لە ڕێگەی بەهێزکردنی پەیوەندییەکانی لەگەڵ ڕێبەرانی جوڵانەوەی ئەرمەنییەکان، شەریف پاشا داوای گەرەنتیکردنی مافی نەتەوەیی ئەرمەنییەکان و کوردانی لە هاوپەیمانان کرد. لەو سۆنگەوە لە پەیماننامەی سیڤەردا هەندێ لە مافەکانی هەردوو

نەتەوەش ئاماژەی پێکراوە. بەگوێرەی ئەو پەیماننامەیە هەندێ مافی سنوردار بۆ کوردان پەسەند کراوە.

بەندەکانی (٦١، ٦٢، ٦٣)ی ماددەی سێیەمی پەیماننامەی سیڤەر، سەبارەت بە پرسی کوردان بوو. بە گوێرەی ئەم پەیماننامەیە دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردی لە باکووری کوردستان پەسەند کرا، بەو مەرجەی کە ئەو دەوڵەتە کوردییەی دابمەزرێ بۆ ماوەیەکی کورت لە ژێر پارێزگاریی هێزی هاوپەیمانەکاندا بمێنێتەوە، ئامانج لەوەش ئەوە بوو: گوایە کاتێک هاوپەیمانەکان گەیشتنە ئەو بڕوایەی کوردەکان گەیشتوونەتە ئەو ئاستەی بتوانن خۆیان بەڕێوەببەن، ئەو کاتە سەربەخۆیی بە کوردان دەدرێت. بەڵام سەبارەت بەو پارچەیەی بە فەڕەنسا درابوو و بە ویلایەتی موسڵ ناودەبرێ، لە جیاتی سەربەخۆیی، پێشبینی بەخشینی ئۆتۆنۆمی کرا. لە هەمان کاتیشدا ئەوەیان پەسەند کرد، کاتێ ئەو کوردانەی لە ژێر ئیرادەی ئۆتۆنۆمیدا دەژین توانیان خۆیان بەڕێوەببەن، ئەو کاتە دەتوانن لەگەڵ ئەو دەوڵەتە سەربەخۆیەدا ببن بە یەک کە لە باکووری کوردستان دادەمەزرێ.

کاتێ سەیری مێژوو بکەین دەبینین کە جوڵانەوەی کورد لە دەرەوەی کوردستان، واتە لە ئەوروپا دامەزرا، چونکە ئەو کوردانەی لە چوارچێوەی سنووری ئیمپراتۆریەتدا دەژیان هێشتا پەیوەستی و پەیوەندییان بە ئیمپراتۆریەتەوە بەردەوام بوو. کوردەکان لەو بڕوایەدا بوون کە

ئیمپراتۆریەتی عوسمانی پارچە پارچە کراو، بۆ دۆخ و پێگەی جارانی خۆی دەگەڕێتەوە. لەبەر ئەوەی جوڵانەوەی کورد لەسەر بنەمایەکی فیوداڵی و خێڵایەتی بوو، هەربۆیە خێڵ و عەشیرەتەکان لەو بڕوایەدا بوون کە دوای رووخانی خەلافەت جوڵانەوەی نەتەوەیی کورد بێمانایە و پێویست نییە، شایەد ئەگەر جوڵانەوەیەکیش هەبێت پێویستە لە پێناو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بێت، نەک لە پێناو کوردان. مستەفا کەمال کە زۆر چاک ئاگاداری ئەم دۆخە بوو، زۆر وەستایانە قۆستیەوە؛ بەکاری هێنا و خستیە خزمەتی خۆیەوە. دوای ئەمەش مستەفا کەمال ڕووی لە کوردستان کرد و لە ژێر دروشمی "رزگارکردنی ئیسلام لە ژێر ناوی تورکیێتیدا" لە تەواوی باکووری کوردستان گەڕا و چەندین کۆبوونەوەی جیا جیای سازدا و گەلێک سەرۆک عەشیرەتی کوردان و شێخ و ڕیش سپیانی لە دەوروبەری خۆی کۆکردەوە. لەمیانی پشتبەستن بەو هێزە، لە لایەک کاریگەری هاوپەیمانانی سنووردار کرد، لە لایەکی تریش ئەو دەوروبەر و کەسایەتییانەی بێکاریگەر کرد کە دەیانویست دەوڵەتێکی کوردی یان ستاتۆیەک بۆ کوردان بە دەست بێنن.

## دەستی ئینگلیزەکان
## لەناو جولآنەوەی شێخ سەعیددا هەبوو

مستەفا کەمال تەنیا بە بەکارهێنانی کوردان لە شەڕی دژ بەوانە سنوردار نەما، بەڵکو لە هەمان کاتدا لە ناکۆکی نێوان تورک- یۆنانیەکانیشدا بەکاری هێنان. ئەوکاتە یۆنانیەکان ئیزمیر و دەوروبەرەکەیان کۆنترۆڵ کردبوو و دەیانویست بیخەنە سەر یۆنان. مستەفا کەمال کوردانی لە شەڕی دژ بە یۆنانیەکانیش بەکارهێنا. هەڵبەتە بەرامبەر بەمەش بە شێوەیەکی داخراو و بێ زەمانەتیش بێ، مستەفا کەمال باسی مافی کوردان و جۆرێک لە فیدراڵیەتی دەکرد.
کوردەکان لەژێر سەرکردایەتی مستەفا کەمال بەرخودانێکی سەرسوورهێنەریان کرد و خوێنێکی زۆریان ڕژاند، ئەمەش گەیشتە ئاستێکی وا بەرز وەک باس دەکرێ لە کاتی دروستکردنی کۆتەڵی سەربازی وندا مستەفا کەمال بڵێ: "شیمانەی مەزن ئەوەیە سەربازی ون کورد بێت". لەگەڵ ئەوەی تەواو دڵنیا نین کە ئەوە بە تایبەت گووتە و گوزارشتی خودی مستەفا کەمال بێ، بەڵام لە هەمانکاتدا نوێنەرێکی مستەفا کەمال لە "سەقاریا" هەمان گوتەی دووبارە کردۆتەوە. هەر وەکو چۆن ئەم ڕەوشە لەدەست چوونی جولآنەوەی نەتەوەییمانی لەگەڵ خۆیدا هێنا، لەهەمان کاتدا پەیماننامەی سیڤەر و ئەنجامەکانیشی لە

دەستچوو و بێکاریگەر مایەوە. واتە بۆ جێبەجێ کردنی پەیماننامەی سیڤەر ئەگەر لە ئاستێکی نزمیشدا بێت داخوازیەکی پشتگیریی لە ئارادابوو، بەڵام ئەو دەرفەتەش لەدەست چوو. ئەمەش دەستی مستەفا کەمال و تورکەکانی بەهێزتر کرد، هەربۆیە کوردان پەلکێشی ناو شەڕێک کران کە بە هیچ شێوەیەک بەگوێرەی بەرژەوەندی کوردان گونجاو نەبوو. هەروەکو ڕۆژی ئەمڕۆمان، وێڕای ئەوەی بە هیچ شێوەیەک لە بەرژەوەندی کورداندا نییە، بەڵام بەهەمان شێوە لە بەرژەوەندی تورکاندا کەوتوونەتە ناو شەڕەوە.

ئەو هیوایەی لەو سەردەمەدا لە دەستماندابوو، چی بوو؟ ئینگلیز لە ڕێگەی ئەو یاریی و گەمەیەی کە بە هۆشیاریەکی مەزن پیادەی دەکرد، بۆ ئەوەی فەرەنسا ڕازی بکات تا لە بەرژەوەندی بەریتانیا دەست لە ویلایەتی موسڵ بەربدات، لیوای ئەسکەندەروونە و دەوروبەرەکەی پێ بەخشین. هەروەها لەگەڵ ئەمەشدا هیچ داخوازی و نیازێکی بەوجۆرەی ئینگلیزەکان نەبوو کە لە پارچەکانی تری کوردستان دەوڵەتێکی سەربەخۆ بۆ کوردان دابمەزرێنن. لە کاتی ڕێککەوتنی مەدرید کە لە دوای یەکەمین جەنگی جیهانی بەسترا، ئینگلیزەکان هێشتا چەندین ناوچەی کوردستانیان نەخستبووە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە. دوای ئەوەی ئینگلیزەکان ڕێککەوتنیان لەگەڵ شێخ مەحمود ئەنجامدا توانیان بچنە ناو شاری سلێمانییەوە. دواتریش

وێڕای ئەوەی مافی ئەوانی بە سەرەوە نەبوو، ناوچەکانی تری ویلایەتی موسڵی باشووری کوردستانیان داگیر کرد و لە ئەنجامی ئەمەشدا سەبارەت بە ویلایەتی موسڵ ناکۆکی و ململانێ لەنێوان ئینگلیزەکان و تورکەکان دەرکەوت. تورکەکان بە ئینگلیزەکانیان دەگووت: "مافی ئەوەتان نییە ئەو ناوچانە داگیربکەن، چونکە کاتی یەکەمین جەنگی جیهانی نەکەوتبووە ژێر دەسەلاتی ئێوە". بەهۆی بەرەوپێشچوونی ئەم ناکۆکیانەش ئینگلیزەکان دەیانخواست ئەم هۆشیارییە نەتەوەییەی لە ناو کورداندا چەکەرەی کردبوو، بقۆزنەوە و بەرامبەر بە تورکان بەکاری بهێنن. هەرچی شێخ مەحمودی نیشتیمانپەروەرە دەیویست دەوڵەتێکی سەربەخۆی کوردی لەم پارچەیەی کوردستان دابمەزرێنێ. شێخ مەحمود نەیدەویست ئەو دەوڵەتە لەژێر کۆنترۆڵ و چاودێری ئینگلیزەکاندا بێت. ئەمەش بووە هۆکاری ناکۆکی و ململانێ لە نێوان شێخ مەحمود و ئینگلیزەکان و لە ئاکامدا شەڕ و پێکدادان لە نێوانیاندا دەرکەوت. خودی شێخ مەحمودیش لەو شەڕەدا بەشداری کرد و بریندراربوو، بە هۆی بریندارییەکەشیەوە بە دیلی کەوتە دەست ئینگلیزەکانەوە. دواتر لە دادگایەکی سەربازی بەغدادا سزای لەسێدارەدانی بۆدرا، بەڵام ئەم سزایە کەمکرایەوە و بۆ زیندانی هەتاهەتایی و درێژخایەن گۆڕا. وەلێ دواتر لەگەڵ ژمارەیەک لە هاوڕێیان و خزم و نزیکەکانی بۆ هیندستان دوور خرانەوە.

دوای ئەم دوور خستنەوەش هەندێک کەس لە باشووری کوردستان داخوازی و هۆشیاری نەتەوەییان هەبوو، ئەمەش هۆکاری بەردەوامی ناکۆکیەکان بوو. بەرامبەر بەمەش هەرچەندە ئینگلیزەکان بە هەندێ شێواز خواستیان بە گوێرەی خۆیان چارەسەری بکەن، بەڵام نەیانتوانی چارەسەری بکەن و سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا. هەربۆیە دووبارە شێخ مەحمودیان هێنایەوە بەغداد و وەک حوکمداری کوردستان پەسەندیان دەکرد. بەڵام مەرجێکیان هەبوو، ئەویش ئەوەبوو کە شێخ مەحمود ڕاوێژکاریی ئینگلیزەکان پەسەند بکات، بەڵام شێخ مەحمود هەر لە سەرەتاوە ئەم داواکاریەی ڕەتکردەوە و پەسەندی نەکرد. دوای ئەوە گەڕایەوە سلێمانی و حکومەتێکی دامەزراند، خۆی وەک مەلیک ڕاگەیاند و ئەنجومەنی وەزیرانی پێک هێنا، دوای ئەوە شانبەشانی پێکهێنانی دامودەزگا جیاوازەکانی حکومەت، ئاڵا و ئەرتەشی پێکهێنا، پۆستەخانەی دامەزراند و پولیشی دەرخست، بەم جۆرە دەوڵەتێکی کوردی دامەزراند.

لەبەرئەوەی ئەو دەوڵەتە کوردییەی کە دایمەزراند ناکۆک بوو لەگەڵ ئەو دەوڵەتە عەرەبییەی کە ئینگلیزەکان دەیانخواست دایبمەزرێنن، لەو سۆنگەوە پێچەوانەی بەرژەوەندی ئینگلیزەکان بوو. هەر بۆیە ئینگلیزەکان بە هۆڤێتیەکی مەزن هێرشیان کردە سەر کوردەکان و بە تەواوی چەک و تفاقیان شاڵاویان هێنایە سەر کوردستان،

تەنانەت سلێمانی بوو بە مەیدانی تاقیکردنەوەی چەکە نوێیەکانی ئینگلیزەکان. بەم جۆرە بۆ جاری دووەم ئینگلیزەکان چوونە ناو شاری سلێمانییەوە و داگیریان کرد؛ بۆ جاری یەکەمیش سوپای عەرەبی ئێراق لە ساڵی ١٩٢٤ چووە ناو شاری سلێمانییەوە، ئەم هاتنەشیان لە ڕێگەی راوێژکاری ئینگلیز و بەکارهێنانی چەک و تفاق و یارمەتی ئینگلیزەکانەوە بەدیهات، ئینگلیزەکانیش داگیرکارییەکەیان پەسەند کرد و مۆریان کرد.

لە ئەنجامی ئەمەشدا ناکۆکی نێوان تورکەکان و ئینگلیزەکان سەبارەت بە مەسەلەی ویلایەتی موسڵ گورچتر بوو. هەر لەبەر ئەمەش ئینگلیزەکان نەیاندەویست کوردەکان بە تەواوی سەرکوت بکرێن، چونکە بەکارهێنانی کارتی کورد بەرامبەر بە تورکەکان بابەتی باس بوو. لەو کاتەی کە شێخ مەحمود لە کوردستان بەردەوامی بە دەسەڵاتی خۆی دەدا، لە بڵاوکراوەیەکی هاوبەشدا کە لە ڕێکەوتی ٢٤ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٢٢دا بڵاوکرایەوە، ئینگلتەرا و ئێراق دانیان بە دەوڵەتە کوردیەکە دادەنا، بەڵام داخوازی شاندێکی کوردیان دەکرد تا بچن، جگە لە دیاریکردنی سنوور لە هەمان کاتدا پرسی پەیوەندییە بازرگانی و ئابوورییەکان لەگەڵ ئینگلیزەکان و ئێراقدا تاوتوێ بکەن. وەلێ لە راستیدا ئامانجی سەرەکییان لەو بڵاوکراوەیە ئەوە بوو کە تورکەکان بترسێنن و وایان لێبکەن دەستبەرداری ویلایەتی موسڵ ببن، بێگومان ئەوەی

روویدا هەر ئەوەبوو. بەمجۆرە سیاسەتی تورکەکان ئاڵۆزی تێکەوت، لە کۆتاییدا تورکەکان لە دوای زەحمەتیەکی زۆرەوە وەفدێکی کۆمەڵەی نەتەوەکانیان خواست تا ئەم ناوچەیە کۆنترۆڵ بکەن و بیخەنە ژێر چاودێری خۆیانەوە. سەبارەت بەم مەسەلەیە تورکەکان و ئینگلیزەکان لە سەر ئەوە ڕێککەوتن کە کۆمەڵەی نەتەوەکان (عصبة الامم) لە واقیع و راستینەی بەرجەستە بکۆڵێتەوە. تەنانەت لە بەڵگەکانی کۆمەڵەی نەتەوەکانیشدا هاتووە کە کوردەکانی باشووری کوردستان نەیانخواستووە، نە لەگەڵ تورکیا و نە لەگەڵ ئێراقدا بەیەکەوە بژین، بەڵام ئەو کاتە کۆمەڵەی نەتەوەکان و ڕای گشتی لە ژێر کۆنترۆڵ و کاریگەری ئینگلیزەکاندا بوو، وەک چۆن ئەمڕۆ ئەمریکا بەسەر نەتەوە یەککگرتووەکاندا باڵادەستە، ئەوکاتیش ئینگلیزەکان بەسەر کۆمەڵەی نەتەوەکاندا باڵادەست بوون.

لە دوای ئەوە لە ٢٥ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٢٥، کۆمەڵەی نەتەوەکان لەگەڵ هەندێ مەرجدا ئەوەی پەسەند کرد کە کوردەکان لە چوار چێوەی دەوڵەتی ئێراقدا بمێننەوە، بەڵام لە هەمانکاتدا بڕیاری ئەوەشی وەرگرت کە ژیان و زمان و کولتووریان پارێزراو بێت.

لە هەمان ڕۆژدا بەبۆنەی ئەم بڕیارەوە ئینگلیزەکان و ئێراقییەکان کۆبوونەوە و ئاهەنگیان گێڕا، وەک دەگێڕنەوە، گوایە بەرپرسیاری وەفدی ئینگلیزیی گوتویەتی: "وەک چۆن تورکەکان دەیانەوێ کوردەکان بکەن بە تورک، نابێ ئێوەش

بیانکەن بە عەرەب، لەوانەیە کوردەکان بەرگەی ستەم و زۆرداریی تورکەکان نەگرن و ببن بە تورک، بەڵام تورکەکان بە شەپقە و چاکەتێک نابن بە ئەوروپایی"، واتە هەروەکو چۆن بە هەر شێوەیەک بێت کوردەکان نابن بە تورک، بە هەمان شێوە تورکەکانیش بە شەپقە و چاکەتێک نابن بە ئەوروپایی. شا فەیسەڵی پادشای ئێراقیش ئەم بۆچوونەی لە جێگای خۆیدا بینیوە و بەردەوام گوتوویەتی: "پێویستە عەرەبەکان کوردەکان وەک کورد ببینن و کوردەکانیش پابەندی کولتووری خۆیان بن و کورد بن". لە دوای ئەم قۆناخە جوڵانەوەی شێخ مەحمودیش شکستی هێنا و کۆتایی پێهات.

خاڵێکی دیکەش کە پێویستی بە ئاماژە پێکردنە؛ ماددەیەکی پەیماننامەی لۆزان سەبارەت بە چۆنیەتی بەڕێوەبردنی موسڵ بوو. ڕاستییە مێژووییەکانی ئەو سەردەمە پێمان دەڵێ کە ڕێککەوتنێک لە نێوان ئینگلیزەکان و تورکەکاندا هەبوو، بە گوێرەی ئەم ڕێککەوتنەش بەرامبەر بە دەستبەردانی تورکەکان لە دۆستایەتیکردنی سۆڤێت، ئینگلیزەکانیش دەستبەرداری پشتگیریی جوڵانەوەی نەتەوەیی کورد بکەن. دواتر کوردەکان تێگەیشتن کە خەڵەتێنراون و فێڵیان لێکراوە، هەربۆیە هەم لە باکوور هەم لە باشوور دەستیان بە تێکۆشانی خۆیان کردەوە. هەرچەندە هەندێ ڕۆشنبیر لە ناو ڕیزی ئەم تێکۆشانەدا هەبوون، وەلێ سەرکردایەتیەکەی زیاتر بە دەستی مەلا و

شێخ و ئاغاكانەوە بوو. یەكێك لەو جوڵانەوانەش جوڵانەوەی شێخ سەعیدی پیران بوو. هەم بۆ ئاشكرا كردن و هەم بۆ ئەوەی لە هەلومەرجەكانی ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا دۆزەكەمان بگات بە سەركەوتن، دان بەوەدا دەنێم كە دەستی ئینگلیزەكان لە ناو جوڵانەوەی شێخ سەعید دا هەبوو، بەڵام ئەم هاوكاریەیان بۆ ئەوە نەبوو كە جوڵانەوەكە بگات بە سەركەوتن، بەڵكو بە پێچەوانەوە بۆ ئەوە بوو زیاتر ڕووبەڕووی شكست بێتەوە. لە سەرەتادا جوڵانەوەكە بەبێ ئاگاداری ئینگلیزەكان دەستی پێكرد و بەهێز ببوو، بەڵام دواتر ئینگلیزەكان دەستیان تێوەردا و دووچاری شكستیان كرد.

نەك تەنها ئەمە، بەڵكو ئینگلیزەكان دەستیان لە شكستی تەواوی ئەو جوڵانەوانەدا هەیە كە لە كوردستاندا دەركەوتن و دواتر دووچاری سەركوتكردن هاتن. بە داخەوە كە لە كۆتایی ئەم قۆناخەدا میللەتی كورد بە هیچ هیوا و مافێكی خۆی نەگەیشت. دوای ئەمە جوڵانەوەی كورد لەسەر بنەمای سیستەمێكی نوێ دیسان سەریهەڵدا و دەستی پێكرد، هەندێ پارت لە لایەن ڕۆشنبیرانەوە دامەزرێنران. بەڵام ئەو پارتانە لەسەر بنەمای وەرگرتنی هەندێ یارمەتی و جێبەجێكردنی داواكاریەكانی دەرەوە، لە لایەن ڕۆشنبیران پێكهێنران؛ بەتایبەتیش لێرەدا پێویستە ئاماژە بە هاریكاری و داواكاریەكانی ئینگلیزەكان بكرێ. چونكە ئینگلیزەكان لێكدانەوەی ئەوەیان دەكرد كە لە ئەگەری دەركەوتنی

جولانەوەیەکی نەتەوەیی عەرەب دژ بەوان بەردەوام پێویستی ئەوەیان دەبینی کە کارتی کورد لە ئێراق بە دەستییەوە بمێنێ.

لەم ماوەیەدا دووەمین جەنگی جیهانی دەستی پێکرد و ئەو کاتیش جولانەوەی کورد لاواز بوو. بەڵام بەشداریکردن و جێگرتنی سۆڤیەت لەو جەنگەدا هەندێ گۆڕانکاریی لەگەڵ خۆیدا هێنا. بە تایبەتیش دوای چوونی ڕووسەکان بۆ ناو ئێران و کۆنترۆڵکردنی، هەروەها چوونی ئینگلیزەکان بۆ ناو پارچەکانی تری کوردستان، ڕێگای لە بەردەم ئەوەدا خۆشکرد کە دووبارە جولانەوەی کورد تاو بسێنێ و بەهێز بێت و گەشە بکات. ئەم دەوڵەتانە لە پێناو بەرژەوەندییەکانی خۆیان کوردەکانیان بەکار هێنا، تەنانەت ئەڵمانیەکانیش لەمیانی پشت بەستن بە هەندێ کەسایەتی هەوڵیاندا کوردان بکەن بە هاوپەیمانی خۆیان.

لە ئێراق بە دەیان پارت و ڕێکخراو هەبوون، هەندێکیان پارتی کوردان بوون، "هیوا" ش یەکێک لەو پارتانە بوو. هەرچەندە چەندین ڕۆشنبیر و نیشتیمانپەروەری کورد جێگای خۆیان لە ناو ڕیزەکانی ئەم پارتانەدا دەگرت، بەڵام بە بۆچوونی من سەرکردایەتی ئەمانە بە ئینگلیزەکانەوە گرێدراو بوون. هەر ئەمەش بووە هۆکاری پارچە بوونی حزبی هیوا. لەم نێوەندەدا لە چوارچێوەی هاندان و

پشتگیریی هەندێ لە ئەندامانی پارتی هیوا کۆمەڵەیەک لە ئێران دامەزرا. ئەو ئەندامانەی پشتگیریی ئەو کۆمەڵەیان دەکرد گرێدراوی ئەو سەرکردانە نەبوون کە وابەستەی ئینگلیزەکان بوون، کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستانیان لە (خۆرهەڵاتی کوردستان) دامەزراند.

لەو سەردەمەدا من دادوەری هەڵەبجە بووم و گۆڤارێکم بە ناوی گەلاوێژ دەردەخست، بەڵام بە هۆی چەندین هۆکاری جیا جیا دەستم لە ئەرکی دادوەریەتی هەڵەبجە بەردا. تا ئەو کاتیش ئەندامی هیچ پارتێک نەبووم. هەرچەندە حزبی هیوا خواستی ببمە ئەندامیان، بەڵام نەبوومە ئەندامیان. دەخوازم ڕووداوێکی ترتان بۆ باس بکەم: لەگەڵ هەندێک کەسایەتی کە دەیانخواست ببن بە ئەندامی پارتی هیوا لە هەمان ماڵدا دەماینەوە، داوایان لێکردم بچمە ڕیزەکانی حزبی هیوا، هەربۆیە چووینە ژوورێکی تر، لەو ژوورەدا دەمانچەیەک و کتێبێکی قورئانی پیرۆز لە سەر مێزێک دانرابوو، ئەوەی لە منیان داواکرد؛ ئەوە بوو سەیری وێنەی سەرۆکی پارتەکە بکەم و دەست لە سەر دەمانچە و قورئانەکە دابنێم و سوێند بخۆم. سوێندیشیان ئەوەبوو کە بڵێی: 'خیانەت لە کوردان ناکەم'. لەو سۆنگەوە، پێیانم گووت: ئەم سوێندەتان تاوانباریەکە بەرامبەر بە کوردان و پێویستە سوێندتان نە بە دەمانچە و

نه به قورئان بێت، بەڵکو پێویستە پێش هەر شتێک سوێند بە گەل بخۆن، ئەگەر لایەنگری میللەت بن پێویستە بڵێن: "تا دوا دڵۆپی خوێنم خزمەتی گەل دەکەم".

لە دوای ئەوەی دەستم لە دادوەرایەتی بەردا، چەندین پارت لە ناویشیاندا حزبی شیوعی عێراقی داوایان لێکردم ببم بە ئەندامیان، هەتا هەندێ لە ئەندامانی کۆمەڵەی ژیانەوەی کورد لە ئێران هاتنە لام و داوایان لێکردم کۆمیتەی نوێیان بۆ پێکبهێنم. ئەمانە لە ساڵی ١٩٤٤ بوو و لە ڕێگەی پۆستە و پۆستەخانەوە پەیوەندییان بە منەوە کرد، پرۆگرامەکەیانم خوێندەوە، کە دوو دێڕی سەرەتام خوێندەوە نووسرابوو: "ئەم کۆمەڵەیە، کۆمەڵەیەکی کوردەکانی ئێران، ئێراق یان تورکیا نییە، بەڵکو کۆمەڵەیەکی کوردستانییە"، ئەم کۆمەڵەیە دەیخواست لە تەواوی پارچەکانی کوردستان لق و کۆمیتەی خۆی ئاوا بکات، دوای بیرکردنەوە، ئەوکاتە پەسەندم کرد ببمە ئەندامی ئەم پارتە، لە بەرئەوەی ئەمە زۆر ناکەوێتە ناو تەوەرەی گفتوگۆکەمان، بۆیە بە لاوەی دەنێم و دەخوازم بێمە سەر بابەتی بارزانییەکان.

## هەر لەسەرەتاوە
## پەدەکە هیچ بەرنامە و ئامانج و پرەنسیپێکی نەبوو

جولانەوەی مستەفا بارزانی لە سالانی ١٩٤٤-١٩٤٥، واتە هەر لەسەرەتاوە جولانەوەیەکی نیشتیمانی و ولاتپارێزی نەبوو، بەلکو خێلەکی بوو. هەندێ ئەندامی باشی وەک "ئەمین ڕەواندزی، عیزەت عەبدولعەزیز و خەیرولڵلا و...هتد" لە ناو حزبی هیوادا هەبوون دەیانخواست ئەم پێکهاتەیە لە جولانەوەیەکی عەشیرەتگەرییەوە دەربخەن و بیکەن بە جولانەوەیەکی نیشتیمانی و نەتەوەیی، بەلام ئەم جولانەوەیە پەرتەوازە بوو؛ چونکە لایەنی خێلەکی زۆر لە لایەنی نەتەوایەتی بەهێزتربوو. هەرلەبەر ئەمە مەلا مستەفا و داورودەستەکەی ناچاربوون بەرەو ئێران برۆن. کاتێ مەلا مستەفا سنوری دەرباز کرد هەندێ بۆچوونی هەبوو، وابزانم ئەویش (لە ژێر کاریگەری حزبی دیموکراتی کوردستان) بیری لەوە دەکردەوە پارتێک بەناوی PDK دابمەزرێنێ. چەند مانگێک دوای ئەوە کۆمەلەی ژیانەوەی کورد کە پێشتر باسمانکرد ناوی گۆڕا و بوو بە (حزبی دیموکراتی کوردستان)، سەرەڕای ئەوەی من بەرپرسی یەکەمی ئەو ڕێکخستنە بووم لە باشووری کوردستان،

بەڵام چۆنیەتی و هۆکاری گۆڕینی ناویم نەدەزانی. دوای ماوەیەکی کورت ئەو کۆمەڵەیەی لە لایەن وڵاتپارێز و نیشتمانپەروەرە بە پرەنسیپەکان پێکهاتبوو، بووە هۆکاری کۆتایی هێنان بە جوڵانەوەی کورد.

وەک دەزانرێ ئەوکاتە قازی محەمەد (بەهۆی هەندێ هۆکاری کەسایەتیشەوە بێت) مەلا مستەفای بەوە تاوانبار دەکرد کە مسۆگەر سیخوڕێکی ئینگلیزەکانە، هێزەکانی مەلا مستەفا لە دوو گوندی ناوچە سنووریەکان لە دۆخێکی پەرێشان کۆببوونەوە. لە ڕاستیدا هەلومەرجی ژیانیان زۆر دژواربوو، تەنانەت هەندێکیان بەهۆی نەخۆشیەوە مردبوون و گیانیان لەدەستدابوو. لەوێوە مەلا مستەفا لە ڕێگەی کەسێکەوە نامەیەکی بۆناردم و لە سلێمانی بە دەستم گەیشت، لە نامەکەدا هەلومەرجی ژیانی نێو هەردوو گوندەکەی بۆ ڕوون کردبوومەوە و داوای ئەوەی لێکردبووم لە سلێمانی کۆمەک و هاوکاری بۆ کۆبکەمەوە و بۆیان بنێرم. هەربۆیە کۆمیتەکەمان لە سلێمانی دووجار یارمەتی کۆکردەوە و بۆمان ڕەوانەکردن. هەروەها جارێکیشان فەرماندەی ناسراوی کورد (نوری ئەحمەد تەها)، لە کۆتایی ساڵی ١٩٤٥ یش یەکێکی بە ناوی (هەمزە عەبدوڵلا)ی نارده سلێمانی.

هەمزە عەبدوڵلا: شۆڕشگێڕێکی چەپڕەوی کورد بوو، دووچاری فشاری دەوڵەتی ئێراق هاتبوو، ناسنامەی ئێراقی لێسەنرابوویەوە و بۆ تورکیا دوورخرابوویەوە. دواتر

چووبووه ئێران، له ڕێگەی ئەم کەسەوه مەلا مستەفا نامەی دووەمی بۆ ناردم. هەروەها نامەیەکی تریشی لەگەڵدا ناردبوو کە بیدەم بە کوڕەکەی شێخ مەحمود، بەڵام نامەکە کراوه بوو؛ نامەکەم خوێندەوه، له نامەکەدا داوای دەکرد: بۆئەوەی مەلا مستەفا بگەڕێتەوه گوند و ناوچەکانی خۆیان، لای شا فەیسەڵ ناوبەینکاری بۆ بکات. چونکە دەرهەق بە ١١١ کەس لە بارزانیەکان بڕیاری مردن و لەسێدارەدان لە ئارادابوو. دەیویست بڕیاری له سێدارەدان نەمێنێ و بۆ زیندانی درێژخایەن بگۆڕدرێ: بەرامبەر بە ئەنجامدانی ئەم گۆڕانکاریەش مەلا مستەفا ئاماژەی بۆئەوه دەکرد کە ئامادەیە بگەڕێتەوه ئێراق. داخوازیەکانی ئەمە بوو.

کۆمیتەکەمان لە ئاستی هەرە بەرزدا کۆبوونەوەیەکی خۆی بەست. لە کۆبوونەوەکەدا بینیمان کە ئەو سەرۆک خێڵانەی پێشتر بەرامبەر بە حکومەتی ئێران پشتگیرییان لە قازی محەمەد دەکرد، گۆڕاون و دژ بە قازی محەمەد دەوەستن (بەپارە کڕدرابوون) و لایەنگیری ئێران دەکەن. مەلا مستەفاش بگەڕێتەوه ئێراق ئەوکاتە کێ بەرگری لە کۆماری مەهاباد بکات. هەر بۆیە ئەو نامەیەی کە مەلا مستەفا ناردبووی نەمدا بە کوڕەکەی شێخ مەحمود، بڕیاری ئەوەماندا لە ئێران بمێنێتەوه و بەرگری لە کۆماری مەهاباد بکات. بەداخەوه لە هەمانکاتدا بەڵگەنامەیەکمان بە ناوی هەندێ کەسایەتی و سەرۆک خێڵ ئامادە کرد و لەگەڵ کوڕی دووەمی شێخ مەحمود "شێخ لەتیف"یش، هەموومان

ئیمزامان کرد و کردمان بە بڵاوکراوەیەک. لە بڵاوکراوەکەدا ئاماژەمان بەوە کردبوو کە پێویستە حکومەتی ئێراقی لە مەلا مستەفا و هاوڕێکانی ببورێ و لێبگەڕێ بگەڕێنەوە گوند و شوێنەکانی خۆیان، هەروەها ئاماژەمان بەوەش کردبوو کە ئەو وەک نوێنەری کوردان دەبینین. لە لایەکی تریش لاوازبوونی قازی محەمەد وایکرد ئیش و کارەکان سەراوژێر بێت و ڕێگەی لە پێش سەرگەردانی و خراپەکاری مەزن کردەوە. لە نامەکەی تری کەوا بۆی ناردبووم داخوازی ئەوەی دەکرد یارمەتی هەمزە عەبدوڵلا بدەم، چونکە ئاماژەی بەوە دەکرد کە دەخوازن پارتێکی لە جۆری PDKی ئێران لە ئێراق دابمەزرێنن. بەڵام من ئەوەم ڕەتکردەوە کە پارتێک بە ناوی PDKی ئێراق بێت و ڕازی نەبووم.

**عەبدوڵلا ئۆجالان:** سەرەتا PDK لە ئێران دامەزرا؟ چۆن کۆبوونەوەی یەکەمی خۆی ئەنجامدا؟ کێ لەو کۆبوونەوەیەدا هەبوو؟ ئامانجە نزیک و دوورەکانی چی بوون؟ ئایا بەرنامەی هەبوو؟ کەس لە کوردەکانی باکوور لە ناو ڕیزی ئەم پارتەدا هەبوو؟ دواتر بۆچی PDK لە باکوور دامەزرا؟ ئایا شەخسێک دایمەزراند یان کۆبوونەوەیەک ئەنجامدرا؟ کاریگەری دەوروبەر لە دامەزراندنی ئەو پارتە چی بوو؟ کاریگەریی هەلومەرجە بابەتیەکان لەوەدا چی بوو؟

## پەدەکەی مەلا مستەفا کوردستانی نەبوو

**ئیبراهیم ئەحمەد:** لەو نامەیەی مەلا مستەفا بۆی ناردبووم داوای لێدەکردم یارمەتی هەمزە عەبدوللا بدەم، هەروەها ئاماژەی بە هەندێ ناو کردبوو کە دەیویست جێگای خۆیان لە ناو ڕیزەکانی ئەم پارتەدا بگرن کە ئامانج بوو دابمەزرێ. هەروەها بینیم کە ئەم پارتە پارتێکی کوردستانی نییە، واتە پارتێکی ئێراقی بوو، بۆیە نەمویست جێگای خۆمی تێدا بگرم. مەلا مستەفا دەیخواست ببێتە سەرۆکی پارت، وەک یارمەتیدەر و جێگریش دەیخواست شێخ لەتیفی کوڕی شێخ مەحمود و کاکە زیادی کۆیی جێگای خۆیان تێدا بگرن. هەروەها کۆمیتەیەکی ناوەندیش پێکبهێنرێ، بەڵام هیچ بەرنامە و ئامانجێکی ئەم پارتە نەبوو، هەروەها پرەنسیپێکی دیاریشی نەبوو لە پێناویدا تێبکۆشێ، تەنیا باس لە هەندێ دروشم و گوزارشتی خۆش دەکرا و دەگوترا: "ئەم پارتە لە پێناو بەرژەوەندییەکانی گەلی کورد دادەمەزرێنرێ".

لەو سەردەمەدا حزبی هاوشێوەی شۆڕش و ڕزگاریش لە ئارادا هەبوون. ئەم پارتانەش ئاماژەیان بەوە دەکرد کە دەخوازن جێگای خۆیان لە ناو پارتێکی بەم جۆرەدا بگرن، بەڵام هەندێ کەسایەتی کورد ئەوەیان زەقکردەوە کە ئەم پارتە پارتێکی عەشیرەتگەرییە بۆیە جێگای خۆیانی تێدا ناگرن، لە دواییدا ئەم پارتە لە ١٦ی ئابی ١٩٤٦ لە ئێراق دامەزرا.

**عەبدوڵلا ئۆجالان:** ئەو کاتە کۆماری کوردستان لە مەهاباد ڕووخا بوو؟

**ئیبراهیم ئەحمەد:** هێشتا نەڕووخا بوو.

**عەبدوڵلا ئۆجالان:** هەڵبەتە لە دامەزراندنی پارتێکی بەمجۆرەدا بوێریی و هێزی سەرەکی خۆی لە کۆماری مەهاباد وەردەگرت؟

**ئیبراهیم ئەحمەد:** مەلا مستەفا سەیری قازی محەمەدی کرد و خواستی وەک ئەو پارتێک دابمەزرێنێ و ببێتە سەرۆکی ئەو پارتە.

**عەبدوڵلا ئۆجالان:** ئەم پارتە چۆن پێکهات؟

**ئیبراهیم ئەحمەد:** لە کۆنگرەی یەکەمدا ئامادەبووم.

**عەبدوڵلا ئۆجالان:** ئەندام بوویت؟

**ئیبراهیم ئەحمەد:** ئەندام نەبووم، بەڵام ئامادە بووم. داوایان لێکردم ببم بە ئەندام، بەڵام پێم ڕاگەیاندن تاوەکو هەواڵێکم لە کۆمیتەی ناوەندی پارتەکەمان لە ئێران بۆ نەیێت و بڕیار

نەدرێت، کۆمیتەکەی سلێمانی هەڵناوەشێنمەوە و نابم بە ئەندامی هیچ پارتێکی تر.

**عەبدوڵلا ئۆجالان:** واتە هەم PDK لە ئێراقدا هەبوو، هەم ئەو کۆمیتەیەی ئێوە جێگای خۆتان تێدا دەگرت، جیاوازیەکی چۆن لە نێوان PDK و کۆمیتەی ئێوەدا هەبوو؟

**ئیبراهیم ئەحمەد:** جیاوازیمان ئەوە بوو کە پارتەکەی ئێمە پارتێک بوو تەواوی کوردستانی لە خۆوە دەگرت، هەتا دەمانخواست کۆمیتەی گرێدراوی خۆمان لە پارچەکانی سوریا و تورکیاش ئاوا بکەین. بەڵام PDKی مەلا مستەفا پارتێکی تایبەت بە ئێراق بوو. واتە تەواوی کوردستانی لە خۆوە نەدەگرت، ئەمە جیاوازی سەرەکی نێوانمان بوو. لە سەردەمی دەسەڵاتی شا فەیسەڵدا PDKی مەلا مستەفا پەیوەندی لەگەڵ کۆمۆنیستەکان (حزبی شیوعی ئێراق) بەست و بەیەکەوەش کار و چالاکییان بەڕێوەدەبرد. لەو قۆناخەدا هەندێ لە ئەندامانی حزبی شیوعی ئێراقی دەستگیر کران، لە دەرەنجامی دانپێدانان و پاکانەی ئەمانە، گەلێک لە ئەندامانی پارتەکانی تریش دووچاری گرتن هاتن.

دوای ڕووخانی کۆماری مەهاباد ئەو کۆمیتەیەی ئێمە لە باشووری کوردستان ئاوامان کردبوو بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی لە ئارادا نەما. هەربۆیە لەو کۆبوونەوەیەی تایبەت بە ئەندامانی کۆمیتە ڕێکمان خست دوو ئەلتەرناتیفمان لە پێشدا هەبوو، یان بچینە ناو حزبی

شیوعی ئێراقی یان پەدەکە/ئێراق: لە ئەنجامی ئەمەدا زۆرینەی ئەندامان بۆچوونی خۆیان بە لایەنی ئەمەدا دەربڕی کە تەڤلی ڕیزەکانی پەدەکە ببین. لەم چوارچێوەیەشدا لە نیسان و مایسی ساڵی ١٩٤٧دا تەڤلی ڕیزەکانی پەدەکە بووین، یەکێ لەو کەسانەی لە ئەنجامی دانپێدانان و پاکانەکانی (اعتراف) شیوعیەکان ناوی هاتبوو من بووم، بۆیە دەستگیر کرام.

**عەبدوڵلا ئۆجالان:** لە تەڤلیبوونی PDK زیاتر ئایا نەتاندەتوانی کۆمیتەکەتان پەرەپێبدەن و تۆکمە و بەهێزتری بکەن؟

**ئیبراهیم ئەحمەد:** دوای ڕووخانی کۆماری مەهاباد هیچ دەرفەت و توانایەکمان نەمابوو، هەربۆیە بە ناچاری تەڤلی PDK بووین.

**عەبدوڵلا ئۆجالان:** دوای ڕووخانی کۆماری مەهاباد، هەبوونی PDKی ئێران هەر بەردەوام بوو؟

**ئیبراهیم ئەحمەد:** نەخێر، لە ئارادا نەما، بەڵام دواتر دیسان دامەزرایەوە. هۆکاری ڕووخانی کۆماری مەهاباد تەنیا ئەوە نییە کە ڕووسەکان پاشەکشێیان کرد و دەستیان لە ئێمە بەردا، بەڵکو هۆکاری سەرەکی سەرچاوەی خۆی لە ڕەوشی ناوخۆیی دەگرت، چونکە ئەو جولانەوەیەی هەبوو، هەروەکو چۆن جولانەوەیەکی ڕزگاری نیشتمانی نەبوو، لە هەمانکاتدا جولانەوەیەکی کوردستانیش نەبوو، من بۆخۆم ئەم ڕاستیانەم بۆ نوسیبوون و ئاماژەم پێکردبوو، ئەو کات

پێم ڕاگەیاندبوون کە: "٥٠٠ لە ئەندامانی سوپای ئێراق بە چەکەکانی خۆیانەوە تا دوا دڵۆپی خوێنیان ئامادەن بۆ بەرگری کردن لە کۆماری مەهاباد خزمەت بکەن، هەروەها چەندین ڕۆشنبیر و فەرمانبەر و نیشتیمانپەروەر هەن، ئەمانەش تا دوا هەناسەیان ئامادەن خزمەتی کۆمار بکەن".
بەڵام وەڵامیان داینەوە کە: "پێویستییان بە هیچ نییە، تەنیا بۆ قوتابخانەکان پێویستییان بە پەرتووکی خوێندن هەیە، هەروەها داوایانکرد پزیشکێکیان بۆ بنێرین". تەنانەت هەندێکیان دەیانگوت: "ئێمە ئەم کۆمارەمان بۆ ئەوە ئاوا نەکردووە کە کوردەکانی ئێراق بێن و دەستی بە سەردا بگرن". واتە دەیانگوت: "دەیانەوێ دەست بەسەر کورسیەکانماندا بگرن".
یەکێک لە ئەندامە خۆ بەدەستەوە دەرەکانی کۆمیتەی ناوەندی حزبی شیوعی ئێراقی، لە کاتی دەرکەوتنی من بۆ دادگا، بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە دەمانەوێ باشووری کوردستانیش بە کۆماری مەهابادەوە گرێ بدەین و دەوڵەتێکی سەربەخۆ دامەزرێنین. هیچ لە بیرم ناچێت کە گوتی: "ئەو ڕۆژەی سوپای ئێران تەبریزی کۆنترۆڵ کرد من لەماڵی ئیبراهیم ئەحمەد بووم"، ڕاستە ئەو شەوە لە ماڵی ئێمە بوو، ئەم کەسە ئەندامی یەدەگی کۆمیتەی ناوەندی شیوعیەکان و لە هەمانکاتدا هاوڕێی شێخ لەتیف بوو؛ ڕاستە ئەو شەوە هەردووکیان لە ماڵی ئێمە گفت و بەڵێنیان هەبوو. هەروەها لە درێژەی دانپێدانانەکانیدا گوتی:

"ئەو ڕۆژەی کە تەوریز کۆنترۆڵ کرا، ئیبراهیم ئەحمەد بە دەم گریانەوە دەیگوت: "چەندە بێبەختین کۆماری مەهاباد هێشتا ساوابوو مرد". لە ئەنجامدا دادگا بڕیاری ئەوەی دەرهەق بە من و گرتووەکانی دیکە دا کە دوو ساڵ زیندانی بکرێین و دوو ساڵیش لە ژێر چاودێری پۆلیسدا بمێنینەوە.

**عەبدوڵلا ئۆجالان:** خۆ بەدەستەوە دەرەکە بە کرێگیراوی ئێراق یاخود ئێران بوو؟

**ئیبراهیم ئەحمەد:** نەخێر. لای حکومەتی ئێراق دانی بە هەموو شتێکدا نابوو و خۆی بە دەستەوە دابوو. بە جۆرێک دۆسێی منیان تاوتوێ دەکرد کە ئەندامی حزبی شیوعیم، سزاکەشم لەو چوارچێوەیەدا بوو. کاتێ لە زیندان بووم هەندێ کەس بۆ سەردانم دەهاتن و پێیان ڕاگەیاندم کە PDK و حزبی شیوعی و پارتەکانی تریش لە نێو ڕەوشێکی زەحمەتدان و لاواز بوونە، چونکە خۆ بە دەستەوەدان و دان پێدانانی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی حزبی شیوعی دۆخەکەی سەراوژێر کردبوو. هەرچەندە ڕەوشی گشتی بەمجۆرە بوو، بەڵام لە ڕاستیدا بەرخودانی مەزنیش لە ئارادابوو. کاتێ لە بەندیخانە بووین هەندێ کەسانی تریش لە گەڵماندا بوون، بۆیە لەگەڵ ئەو کەسانە ڕێککەوتین کە بۆ سەردانمان دەهاتن، دوای دەرکەوتنمان لە زیندان کۆنفرانسێک ببەستین. دوای ئەوەی لە بەندیخانە دەرکەوتین ئەو کۆنفراسەمان گرێدا؛ لە کۆنفرانسدا ناڕازی بوون بەرامبەر بە کۆمیتەی ناوەندی کۆن دەرکەوت، لە

دەرئەنجامی ئەم ناڕازی بوونانەش کۆمیتەی ناوەندی نوێ هەڵبژێردرا. هەروەها بڕیاری ئەوە درا کە حیساب لە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی پێشوو وەربگیرێ و پرۆگرامێکی نوێ بۆ پارتی بنووسرێ. لە ئەنجامی ئەم گۆڕانکاریەشدا پێنج تا دە کەس لەگەڵ (هەمزە عەبدوڵلا) کە تا ئەو کاتە کاری سکرتێری PDKی دەکرد لە پارتی جیا بوونەوە، کاتێ (هەمزە عەبدوڵلا) لە PDK جیا بۆوە گووتی: "لەبەر ئەوەی من وەکیلی مەلا مستەفام، ئەندامێکی ڕاستەقینە و هەمیشەییم".

لە سەرەتای ساڵی ١٩٥٣دا ناوی کۆنی پارتی "پارتی دیموکراتی کورد"مان گۆڕی و کردمان بە "پارتی دیموکراتی کوردستان"، ئامانجیشمان لەم گۆڕانکاریەدا ئەوە بوو لە لایەک نەتەوەپەرستی بەرتەسک دەرباز بکەین، لە لایەکی تریش جەماوەرێکی بەرفراوانتر بگرینە خۆ. هەروەها لە سەر بنەمای سوود وەرگرتن لە بۆچوونەکانی (ماو و ستالین)، ئەوەمان ڕاگەیاند کە خاوەنی بۆچوونێکی سۆسیالیستی زانستین و دەستمان بە تێکۆشان کرد.

خەباتی ئێمەش وەکو پارتەکانی دیکە خۆی لەوەدا دەبینیەوە کە خۆپیشاندان و ڕێپێوان ئەنجام بدرێت و بەیاننامە بلاوبکرێنەوە. ئەو کاتە گەلێک لە پارتەکانی ئێراق ڕێککەوتنیان دەبەست و بەرەیان پێکدەهێنا، بەڵام وەک پارتی ئێمە لە نێو هیچ یەکێتی و بەرەیەک پەسەند نەدەکراین. لەبەر ئەوەی ئێمەیان بە پارتێکی کورد و

کوردستانی دادەنا و بە جوداخواز لە قەڵەمیان دەدایە، دەیانگوت: جێگای پارتێکی جوداخواز لە ناو بەرە و یەکێتیەکدا نییە کە لە پێناو یەکێتی ئێراقدا بێت. وەک پەدەکە پەیوەندییەکانمان لە گەڵ حزبی شیوعی هەندێ جار باش و جارانێکیش خراپ دەبوو، بەمجۆرە بەرێوەدەچوو. جیاوازی سەرەکی نێوانمان لە سەر ئەوە بوو؛ "ئایا مافی کوردان لە مافی چارەی خۆنووسیندا هەیە یان نا"، حزبی شیوعی ئێراقی ئەمەی پەسەند نەدەکرد.

لەو قۆناخەدا پارتیمان وەکو قوتابخانەیەک وابوو، ئەوانەی دەهاتن تەڤلی ئێمە بن دوای ئەوەی پەروەردەی سەرەتاییان دەبینی دەچوونە ڕیزەکانی حزبی شیوعی ئێراقی. بەڵام لە دوای ساڵی ١٩٥٣ ئەم دۆخە گۆڕا، ئیتر ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی حزبی شیوعیش وەک ئەندامێکی ئاسایی تەڤلی ڕیزەکانی پارتی ئێمە دەبوون. لەو سۆنگەوە، لەم قۆناخە بە دواوە قورساییەکی جوڵانەوەی کوردی دەرکەوتە مەیدان. لە هەمانکاتدا ئیتر جوڵانەوەی نەتەوەیی عەرەب پارتی ئێمەی وەک مەترسیەکی گەورە دەبینی، ئەم رەوشە تا ١٤ی تەمووزی ساڵی ١٩٥٨ بەردەوام بوو.

**عەبدوڵلا ئۆجالان:** مامۆستا لەو قۆناخەدا بوون بە سکرتێری پارتی؟

**ئیبراهیم ئەحمەد:** هەرچەندە بە شێوەیەکی فەرمی نەبێت، بەڵام لە ساڵی ١٩٥١ بە دواوە سکرتێری پارتی بووم، وەلێ

به شێوەیەکی فەرمی لە کۆنفرانسی ساڵی ١٩٥٣ تا جیابوونەوەکەی ساڵی ١٩٦٤ سکرتێری گشتی پارتی بووم. جیابوونەوە لە ساڵی ١٩٦٤ تا ساڵی ١٩٧٠ بەردەوام بوو، کاتێ لە یەکتر جیابووینەوە هەردوو لایەنیش ناوی هەمان پارتیمان بە کاردەهێنا. بە کورتی لە ساڵی ١٩٥٣ تا ساڵی ١٩٧٠ ئەرکی سکرتێری گشتی پارتیم بەڕێوە برد.

**عەبدوڵلا ئۆجالان:** کاتێ ئێوە ئەرکی سکرتێری پارتیتان بەڕێوەدەبرد، چ جۆرە گۆڕانکارییەک لە بواری ئایدیۆلۆژییەوە ڕوویدا؟

**ئیبراهیم ئەحمەد:** کاتێک لە ساڵی ١٩٥٣ لە کۆنفرانسدا پرۆگرامی پارتیمان گۆڕی، شیوعیەکان گووتیان: "ئەوانیش بوون بە شیوعی، بەڵام بۆچی دوو پارتی شیوعی لە وڵاتێکدا هەبێت"، هەربۆیە دژی ئێمە وەستان و لە گەڵماندا کەوتنە ململانێوە. واتە دەیانگووت ئایدیۆلۆژیاکەمان کۆمۆنیستییە.

**عەبدوڵلا ئۆجالان:** لەو قۆناخەدا ڕەوشی ئەوانە چۆن بوو کە وابەستەی مەلا مستەفا بوون؟

**ئیبراهیم ئەحمەد:** لەبەر ئەوەی لەو قۆناخەدا ئەوان لە ڕووسیا بوون، نە پەیوەندییەکمان لە گەڵیاندا هەبوو، نە زانیاریەکیشمان لە بارەیانەوە هەبوو، تەنانەت هیچ کەسێک جێگاکەی مەلا مستەفای نەدەزانی.

**عەبدوڵلا ئۆجالان:** هیچ پەیوەندیەکی لەگەڵ بنەماڵە و عەشیرەتیشدا نەبوو؟

**ئیبراهیم ئەحمەد:** لەگەڵ هیچ کەسێکدا، نە پەیوەندی لەگەڵ وڵاتەکەیدا و نە لەگەڵ عەشیرەت و بنەماڵەکەشیدا نەبوو. ئەوکاتە لە ئاسیای ناوین بوون، لەساڵی ١٩٥٦-١٩٥٧ لە مۆسکۆ کۆنفرانسێکی جیهانی بۆلاوان ئەنجام درا، ئێمەش بە ناوی پارتی (جەلال تاڵەبانی)مان وەکو نوێنەرێک نارد، لەکاتی ئەم کۆنفرانسە لە مۆسکۆ لەگەڵ مەلا مستەفا چاویان بەیەکتر کەوتبوو، کە جەلال تاڵەبانی گەڕایەوە وێنەیەکی مەلا مستەفا و دوونامەی لەگەڵ خۆیدا هێنا، ئەو دوو نامەیە یەکێکیان بۆ شەخسی من، ئەوەی تریشیان بۆ پارتی ناردبوو، بارزانی لە نامەکانیدا داوای لە ئێمە دەکرد لەگەڵ هەمزە عەبدوڵڵا ڕێککەوین و دووبارە بیگەڕێنینەوە ناو ڕیزەکانی پارتی.

**عەبدوڵڵا ئۆجالان:** ئەو کاتە هەمزە عەبدوڵڵا بۆ کوێ چوو بوو؟

**ئیبراهیم ئەحمەد:** لەو کاتەدا هەمزە عەبدوڵڵا زیاتر مەیلی بە لای شیوعیەکانەوە بوو.

**عەبدوڵڵا ئۆجالان:** نامەی دووەم چی بوو؟

**ئیبراهیم ئەحمەد:** کاتێ نامەی دووەمم کردەوە و سەیرم کرد، واقم وڕما، کاتێ من گەنج بووم و شێخ مەحمود لە هیندستان لە هەندەران (مەنفا) بوو، موریدەکانی ڕێپێوانیان دەکرد و داوایان لە ئینگلیزەکان دەکرد کە بیگەڕێننەوە. هیچ شتێک لە نامەکەی مەلا مستەفادا نەبوو، بە گوێرەی لۆژیکی موریدی تکای لێدەکردین و دەیگوت: "ئەم نامەیە بگەیەنن بە

شێخ ئەحمەدی برام". ئەمە وەک مورید بوو، داوای لە من دەکرد نامەی دووەم بکەیەنم بە شێخ ئەحمەد کە لە بەندیخانەی شاری بەسرە بوو. لە سەر ئەم تەوەرەیە کۆمیتەی ناوەندیم کۆکردەوە و گفتوگۆمان کرد. لەو بڕوایەدا بووین ئەگەر ئەم نامەیە بکەوێتە دەست حکومەت، شێخ ئەحمەد لە سێدارە دەدەن. لە لایەکی تریش ئەو مەلا مستەفایەی وەک کەسایەتیەکی شکۆدار دەبینرا، تەواو وەک مورێدێک نامەکەی نوسیبوو. کەچی لەو سالانەدا لەو بەیاننامانەی کە بلاومان دەکردەوە دەمان نووسی "بژی ئازادی، بژی کوردستان لە ژێر ڕێبەرایەتی ژەنەڕاڵ مستەفا بارزانی".

لەو سالانەدا نەتەوەپەرستانی عەرەب لەگەلماندا کەوتنە نێو پەیوەندییەوە، سالێک پێش بەرپابوونی شۆڕشی ١٤ی تەمموز نەتەوەپەرستانی عەرەب نامەیەکیان بۆ ناردبووم، تێیدا ئاماژەیان بەوە کردبوو: "لە حالەتێکدا دژ بە ڕژێمی شا فەیسەل دەست بە خەبات و تێکۆشان بکەن، ئەو کاتە جەمال عەبدول ناسر بە پێدانی چەک و تەقەمەنی پشتگیریتان لێدەکات". نەتەوەپەرستانی عەرەب داوایان لێکردم بچمە بەغداد و لەوێشەوە بچمە لای جەمال عەبدول ناسر و چاوم پێی بکەوێت، هەمان کەس لە دوای سەرکەوتنی شۆڕشی ١٤ی تەمموز بوو بە وەزیر. بەلام لەبەر ئەوەی بڕیاری دادگا لە سەر من هەبوو، نەمدەتوانی خاکی ئێراق بە جێبهێلم و دەرفەتی ئەوەم نەبوو بچمە

دەرەوە. هەربۆیە تکام لە وەزیری ناوخۆ کرد (کە بۆ خۆی کورد بوو)، بە گوێرەی ئەو ڕاپۆرتەی دکتۆر (بۆی ڕێکخستبووم) کە بە دەستمەوە بوو، گوایە تووشی نەخۆشییەک هاتبووم کە نزیکی شێرپەنجەیە. داواکاری ئەوەم کرد کە بە ئامانجی چارەسەری پاسپۆرتم بدەنێ تا بتوانم بچمە دەرەوەی وڵات، وەزیری ناوخۆ بە شێوەیەکی ڕاشکاوانە پێی ڕاگەیاندم کە بۆ ماوەی دوو مانگ ئارام بگرم. ئەوکاتە یان بێ پاسەپۆرت و بێ مۆڵەت وەرگرتن دەتوانی بچیتە دەرەوە، یان لەوانەیە هیچ کاتێک نەتوانی لە ئێراق بچیتە دەرەوە. دوای مانگێک نیاز وابوو لە ڕێگەی ئوردنەوە سوپای ئێراق بنێرنە بەیروت، تا بەیروت بخەنە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە. پیلان ئەمە بوو، بەڵام ئەو سوپایەی سازدرابوو بچێت بەیروت کۆنترۆڵ بکات، ڕووی لە بەغداد کرد و ڕژێمی پاشایەتی ڕووخاند و شۆڕشی ١٤ی تەمموز ئەنجامدرا.

## لە دوای شۆڕشی ١٤ی تەممووز
## دەرفەتێکی گرنگ بۆ باشووری کوردستان ڕەخسا

**عەبدوڵڵا ئۆجالان:** بە شێوەیەکی سەرەکی کێ بوون ئەوانەی ئەم شۆڕشەیان ئەنجامدا؟

**ئیبراهیم ئەحمەد:** فەرماندە و سەربازە نەتەوەپەرست و ئاشتیخواز و ئازادیخوازەکان بوون.

**عەبدوڵڵا ئۆجالان:** هی کوردیش لە ناویاندا هەبوون؟

**ئیبراهیم ئەحمەد:** بەڵێ کوردیش هەبوون، نامەیەکم بۆ ئەم حکومەتە شۆڕشگێڕییە نووسی کە دوای سەرکەوتنی شۆڕش پێکهات، تێیدا ئاماژەم بەوە کردبوو کە پشتگیریی لە دەسەڵاتێکی دیموکراسی دەکەین کە هاوپەیمانێتی بەغداد ڕەت بکاتەوە و لەسەر بنەمای یەکسانی نێوان تەواوی گەلانی ئێراق بەڕێوە بچێت. دوای دوو ڕۆژ مەکتەبی سیاسیمان کۆبووەوە و بڕیاری ئەوەی دا کە شاندێک پێکبێت، بچێتە بەغداد و لەگەڵ سەرۆکی حکومەتدا چاوپێکەوتن ساز بدات. شاند لە من و ئەندامی مەکتەبی سیاسی عەلی عەبدوڵڵا پێکهاتبوو. یەکەم داخوازی و مەرجمان بۆ حکومەتی شۆڕش؛ گەڕانەوەی مەلا مستەفا، ئازادکردنی شێخ ئەحمەد و گیراوەکان بوو. ئەوەبوو شێخ ئەحمەد ئازاد کرا و لە بەغداد نیشتەجێ کرا، مەلا مستەفاش لەو شوێنەی کە لێی بوو، پەیامێکی پیرۆزبایی بۆ ڕێبەری

شۆڕش نارد و ئاماژەی بەوە کردبوو کە دەیەوێ بگەڕێتەوە ئێراق.

من و نوری ئەحمەد تەها بە پاسەپۆرتێکی ساختە چووینە "پراگ"ی پایتەختی چیکۆسلۆفاکیا، پاسەپۆرتی ساختە داخوازی حکومەتی ئێراق بوو، چونکە پێش ئەوەی بچینە دەرەوە و کاتێ سەردانی وەزیری ناوخۆ (کە لە هەمانکاتدا جێگری سەرۆک وەزیران بوو) مان کرد، ئاماژەم بەوە کرد کە داخوازی و ئومێدم ئەوەیە کە لە سەر بنەمای هاوبەشێتی کورد و عەرەب، لەسەر ئەم خاکەدا مافەکانی کوردان لە چوارچێوەی دەستووردا بکەوێتە ژێر گەرەنتییەوە. خاڵێکی تری کە پێویستە ئاماژەی پێبکەین، پێش ئەوەی بەغداد بەجێبێڵین دەمخواست بە هاوڕێیان بڵێم بۆ ئەوەی خۆپیشاندان و ڕێپێوان لە هەر شوێنێکی کوردستان ئەنجام بدەن، چونکە لە دەستوردا تەنیا باس لە برایەتی کورد و عەرەب دەکرا، بەڵام پێویست بوو کوردان هەندێ ماف بەدەستبێنن، هەروەها سەبارەت بە جێگیرکردنی مافی ئۆتۆنۆمی لە چوارچێوەی دەستوردا، چاوپێکەوتنمان لەگەڵ ئەو پارتانە ئەنجامدا کە جێگای خۆیان لە نێو شۆڕشدا گرتبوو، بەڵام هیچ یەکێک لەو پارتانە ئەم داواکاریانەی ئێمەیان پەسەند نەکرد.

لەو دیدارەدا وەزیری ناوخۆ پێی گووتم: "کاتێ لەگەڵ مەلا مستەفا گەڕانەوە، لە ڕێگەی تورکیاوە نەیەن، بەڵکو بە ڕێگای میسرەوە بگەڕێنەوە، هەروەها لەگەڵ جەمال عەبدول ناسر چاوپێکەوتن ئەنجام بدەن و داواکاریەکانتان لەو بخوازن، ئەگەر ناسر مافەکانتان پەسەند بکات، ئێمەش پەسەندی دەکەین". چووینە پراگ و کاتێ لەگەڵ مەلا مستەفادا ویستمان بگەڕێینەوە کاربەدەستانی یەکێتی سۆڤیەت پێیان ڕاگەیاندین کە پێویستە لە ڕێگەی تورکیاوە بگەڕێینەوە، چونکە ئەگەر وانەبێ شیمانەی ئەوە هەیە تورکەکان فڕۆکەکە بخەنە خوارەوە. دواتر گەیشتینە میسر و چووینە کونسوڵخانەی ئێراق لە میسر و ئاگادارمان کردنەوە سەبارەت بە گەیشتنمان بۆ میسر، ئەوانیش لە وەڵامدا پێیان گووتین: "میوانی دەوڵەتن". دواتر جەمال عەبدول ناسر پێشوازی لێکردین، لەو چاوپێکەوتنەدا باسی ماف و ڕەوشی کوردانمان بۆ ناسر کرد. هیچ ناڕازی بوونێکی بەرامبەر بە قسەکانمان نیشان نەدا، بەڵام کاتێ ئێمە لە بەغداد جیا ببووینەوە لە دەرەنجامی هەندێ جموجۆڵەوە نێوانی ئێراق و میسر تێکچوو بوو.

## دەوڵەتی تورکیا دوژمنایەتی تەواوی کوردان دەکات

ڕۆژێکیان لەگەڵ باڵیۆزی ئێراق لە میسر دانیشتبووین، ئەو هاوڕێیەی لەگەڵم بوو، هاتە لام و پێی گووتم: "نوێنەری کۆنسوڵی تورکیا زۆر تورەیە و دەخوازێ چاوی پێت بکەوێ"، لە وەڵامدا پێم گووت: "هیچ بەڵێن و گفتێکمان بە یەکتری نەداوە، ئەگەر چاوەڕێ بکات دەتوانین یەکتری ببینین". لە ناکاو کۆنسوڵی تورکیا هاتە ژوورەوە، هات لە پێش من وەستا و بە دووڕدۆنگی سکاڵانامەیەکی ناڕەزایی پێشکەش کردم، بە زارەکیش پێی گووتم: "لەبەر ئەوەی دەستتان لە کاروباری ناوخۆی ولاتەکەم وەرداوە، بە ناوی دەوڵەتەکەمانەوە شەرمەزارتان دەکەم"، منیش پێم گووت: "ئەو مەسەلە ناوخۆییە چییە کە ئێمە دەستمان تێوەرداوە؟"، لە وەڵامدا پێی گووتم: "پرسی کوردە"، منیش پرسیارم لێکرد: "پەیوەندی ئێوە بە پرسی کوردەوە چییە؟ وەکو تریش دەستوەردانمان نەکردووە". پرسیارم لێکرد: "لە ولاتی ئێوەدا کورد هەیە؟"، لە وەڵامدا گوتی: "نەخێر". منیش پێمگووت: "لە تەلەفزیۆن و ڕادیۆ و ڕۆژنامەکاندا تەنیا یەک وشەی کوردیم بۆ بێنە، کە لە چوارچێوەی سنووری

دەوڵەتی ئێوەدا گوترابێ و گوزارشتی لێکرابێ، ئەو کاتە دەزانم کە دەستمان لە کاری نێو خۆتان وەرداوە یان نا". لە ئەنجامی ئەم وەڵامەدا کۆنسوڵی تورکیا توڕەبوو و بۆی دەرچوو، جارێکیتر یەکتریمان نەبینییەوە.

بۆچی تورکەکان پرسی کورد و کوردستان بە تایبەتیش باکووری کوردستان زۆر گرنگ و هەستیار دەبینن؟ پێش هەر شتێک، چونکە دەوڵەتی تورک بەرامبەر بە کوردان خاوەنی سیاسەتێکی توندی نکۆڵی کردنە، هەروەها دەوڵەتی تورک تەنیا دوژمنایەتی کوردەکانی باکووری کوردستان ناکات، بەڵکو دوژمنایەتی کوردانی تەواوی پارچەکانی کوردستان دەکات.

لە ڕاستیدا کۆماری تورکیا دوژمنی سەرەکی کوردانە، چونکە تا ئێستا کۆماری تورکیا دانی بە ناوی کوردان و ناسنامەکەشیان نەناوە. هەر بۆیە پێویستە هەر کوردێکی ڕەسەن، ڕاستەقینە و نیشتیمانپەروەر ئەو حەقیقەتە تێبگات و بزانێ، **ئەگەر کوردەکانی باکووری کوردستان مافەکانیان بە دەست نەهێنن، تەنانەت لە هەر پارچەیەکی تری کوردستان دەوڵەتێکی سەربەخۆش دابمەزرێ و هەموو جیهان پشتگیریی لێ بکات، ئەگەر پرسی کورد لە باکووری کوردستان چارەسەر نەبێت، ئەوا ئەو دەوڵەتە سەربەخۆیەی کە دادەمەزرێ مسۆگەر دەڕووخێ.**

دەوڵەتەکانی تر بە ڕێژەیەکی سنووورداریش بێت ناسنامەی کوردیان پەسەند کردووە، بەڵام لەبەر ئەوەی تورکیا دان بە

ناوی کورد و ناسنامەکەیدا نانێت، ئەوا وەک چۆن بە دەستهێنانی مافی کوردانی پارچەکانی دیکەی کوردستان ئەستەمە، تەنانەت مافی ژیانیشیان نابێت. **هەربۆیە لەو بڕوایەدام کە پێویستە هەر کوردێکی دڵسۆز و بەشەرەف نەک تەنیا پشتگیریی لەم جوڵانەوەیە بکات، بەڵکو پێویستە لە ژێر پێشەنگایەتی جوڵانەوەی هاوچەرخی گەلی کورد (PKK) و ڕێبەرایەتی سەرۆکی هێژا عەبدوڵڵا ئۆجالان بەڕێوەبچێت و تێکۆشان بکات. سەرکەوتنی جوڵانەوەی ڕزگاری نیشتیمانی کوردستان لە باکووری کوردستانە و بە دەستی کوردەکانی باکووری کوردستانەوەیە.** ئەمەش یەکلاییکەرەوەیە.

**عەبدوڵڵا ئۆجالان:** دەتوانن هەڵسەنگاندنی خۆتان تا ساڵانی حەفتاکان درێژە پێ بدەن.

**ئیبراهیم ئەحمەد:** دوای ئەوەی من هەڤاڵان و سەرۆکی خۆم بینی، بووم بە یەکێک لە ئێوە. واتە بووم بە ئەندامی پارتەکەتان، نەک وەک کەسێکی هەشتا ساڵی، بەڵکو هەست دەکەم گەنجم، دەتوانین بە سەعات گفتوگۆ بکەین، ئێوە خوێنی خۆتان ئەڕژێنن و فیداکاریی دەکەن، منیش بە گوێرەی ڕەوشی خۆم فیداکاریی دەکەم.

**عەبدوڵڵا ئۆجالان:** چییە ئەوەی دەهێڵێ مرۆڤ قسە بکات؟ کاتێ ئامانج مەزن و شکۆدار بێ، مرۆڤ دەتوانێ تا بەیانی بەردەوام بێ. واتە ئەگەر شوێنێکی دیکە بێ، بەمجۆرە بەڵێن نادەن و گەنج نابنەوە.

**ئیبراهیم ئەحمەد:** ڕاستە.

**عەبدوڵلا ئۆجالان:** ئەگەر مرۆڤ پەیڕەوی ڕێبازی شکۆدار بکات، ئەو ئامانجە هەرچەندە سەختیش بێت، مرۆڤ بێزار و تەنگەزار نابێ.

**ئیبراهیم ئەحمەد:** لەبەر ئەوەی ئەو کار و خەباتەی ئەنجامتان داوە ئومێد و خەیاڵەکانم بەدیدێنێ، هەست دەکەم وەک تازە خوێن گەرمێک گەنج بوومەتەوە.

**عەبدوڵلا ئۆجالان:** هەڵبەتە ئامانجتان کوردستانێکی ئازاد بوو، هەر لەم پێناوەشدا دوای ساڵی ١٩٤٧ و پێش ئەو کاتەش کار و خەباتێکی گرنگتان بەڕێوە برد، بێگومان هەمووی لە پێناو کوردستانێکی ئازاد بوو، ئێستاش دەبینین PKK بۆتە دەرگا و کلیلی کوردستان، PKK خودی گەلی کوردستانە. مامۆستا هاوار و هەڤالانیش ئەم ڕاستییە باش دەزانن. لەوانەیە چەند هەنگاوێکی بچووکمان هاویشتبێت، بەڵام مەزنایەتی PKK لە کوێوە دێ؟ هاوێشتنی هەنگاوێکی بچووک لە باکووری کوردستان بۆ تەواوی کوردستان مانای سەرکەوتن و هەنگاوی مەزن دەبەخشێ، هاوێشتنی هەنگاوێک لە باکووری کوردستان، بە واتای هاوێشتنی هەزاران هەنگاوی پێشکەوتن دێ لە پارچەکانی دیکەی کوردستان، بە تایبەتیش لە باشوور و خۆرهەڵاتی کوردستان، واتە هەنگاوەکانی پەکەکە هێندە بە کاریگەر و گرنگن.

خاڵێکی تریش ئەوەیە کە قەڵەمبازە شۆڕشگێڕییە مەزنەکانی باکووری کوردستان وایکردووە کۆماری تورکیا جگە لە کوردەکانی باکووری کوردستان، ئامادە بێت یارمەتی کوردانی پارچەکانی تر بدات، هەر بۆیە تا ڕادەیەک ئەم حکومەتە فیدراڵیەی باشووری کوردستانی پەسەند کردووە. ئەمەش خاڵێکی گرنگە. کەچی شەڕێکی تایبەت و بێ پەروا دژ بە شۆڕشی باکوور بەڕێوەدەبات، ئەگەر شۆڕشەکەمان لە باکووری کوردستان سەرکەوتن بەدەست بێنێ، یاخود دەوڵەتی تورکیا دان بە ناسنامەمان دابنێ، ئەوا باشوور و خۆرهەڵاتی کوردستان دەبن بە خاوەن ستاتۆ و دەوڵەت. هەر بۆیە دەڵێم ئەگەر دەتانەوێ ببن بە دەوڵەت، پشتگیریی لە شۆڕشی باکووری کوردستان بکەن. لە حاڵی حازردا ئەو هەڵمەتەی ئێستا لە باشووری کوردستان پیادەی دەکەین لە هەمانکاتدا لە پێناو شۆڕشی باکوورە. ئەگەر شۆڕشی باکووری کوردستان بەهێز بکەین، مەسەلەی باشووری کوردستانیش بە چارەسەری دەگات.

گەیشتینە مێژووی شەستەکان، واتە سەرەتای شۆڕش؛ لە دوای شۆڕشی ١٤ی تەمموز دەرفەتێکی گرنگ بۆ باشووری کوردستان ڕەخسا، هەر وەکو چۆن لە مێژوودا پرسی کورد بە چارەسەری نەگەیشت، بەڵکو سەختتر و ئاستەم و قورستربوو. نەخۆشیەکانی جوڵانەوەی ساڵی ١٩٦١ لە دەستکەوتەکانی زیاترن، خراپیەکانی ئەو یاخیبوونە زۆر لە لایەنە ئەرێنیەکانی زیاترن، بێگومان

هۆکاری ئەمەش بۆ سەرۆکایەتیەکەی دەگەڕێتەوە، چونکە گەلێک تاکتیکی چەوت پەیڕەوکران، لە ئەنجامیشدا دیکتاتۆریەت لە ئێراقدا دەسەڵاتی گرتە دەست و زاڵ بوو. جوڵانەوەی کوردیش زۆر لاوازبوو، ئەم لاوازییە تا ڕۆژگاری ئەمڕۆشمان هەر بەردەوامە، لەم چوار چێوەیەشدا زیانی بە تەواوی کوردستان گەیاند. بەمجۆرەش دیکتاتۆریەت لە جوڵانەوەی کورددا باڵادەست بوو، هەروەها لە ئێراقیشدا دیکتاتۆریەت پەرەی سەند، ئەم دوو دیکتاتۆریەتەش بە شێوەیەکی زۆر خراپەکارانە یارییان بە کوردان کرد، لە ئەنجامی پشتگیریی دەرەوەش بۆ ئەم دیکتاتۆریەتانە نەتەوەی کورد زیانی زۆر مەزنی بەرکەوت. ئەو زیانەی لەو ٤-٥ ساڵەدا هاتە ئاراوە زۆر لەو زیانە مەزنترە کە لە ماوەی نێوان هەردوو جەنگی جیهانی بە کوردستان گەیشتووە. لە ماوەی نێوان ساڵانی ١٩٤٥-١٩٦٠ کوردستان زیانێکی بەمجۆرەی بەرنەکەوتبوو، واتە لە ساڵانی ١٩٦٠ کان بە دواوە سەرکردایەتی مەلا مستەفا هەموو شتێکی بچووک و بەرتەسک کردەوە.

مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدیش لەو ساڵانەدا خەباتی کرد. بۆچی ئەمە ڕوویدا؟ هەڵە چی بوو؟ بژاری ڕاست کامە بوو؟ سەرۆکایەتی و پارتی بۆرژوازیی کورد لە چ ڕەوشێکدا بوون؟ لە ئەنجامدا بۆچی ئەم دیکتاتۆریەتە لە ئێراقدا پێشکەوت و جوڵانەوەی کورد لەنێو چوو؟ بۆچی ئەم نەخۆشیەی سەرکردایەتی کورد تا ئێستاکە بەردەوامە؟

## شۆڕشی کوردستان شۆڕشی مێژوو و ژیانه

**ئیبراهیم ئەحمەد:** له سەردەمی عەبدولکەریم قاسم دا جولانەوه و پرسی کورد نەک تەنیا له باشووری کوردستان، بەڵکو له تەواوی پارچەکانی کوردستان بووه یەکێک له پرسەکانی قۆناخ. لەبەر ئەوەی بووه یەکێک له پرسه سەرەکییەکانی ناوچەکه و جیهان، بۆیه تاوتوێ کردن و هەڵوەستەکردن بووه پێویستیەک. تەنانەت دەوڵەته جیهانییەکان و دەوڵەتانی ناوچەکه له ڕێی کۆنسوڵخانەکانی ئێراق به شێوەیەکی تایبەت پەیوەندییان به جولانەوەی کوردەوه نیشاندەدا، له هەمانکاتیشدا پەدەکەیان وەک جولانەوەیەکی سیاسی و نوێنەری میللەتێک پەسەند دەکرد. حکومەتی ئێراق بۆ جاری یەکەم دانی بەوە دانا که کورد و عەرەب له نێو خاکی ئێراقدا هەن، هەروەها پەدەکەشی وەک پارتێکی سیاسی کوردان پەسەند کرد. هەر لەم چوار چێوەیەشدا له سەردەمی عەبدولکەریم قاسم له بەغداد ڕۆژنامەیەکمان وەک ئۆرگانی پەدەکه به ناوی خەبات دەرکرد. لەم ڕۆژنامەیەدا نووسینی سەبارەت به کوردەکانی ئێران و تورکیا به شێوەیەکی ئاشکرا و ئازاد دەنووسرا، هەربۆیه ئاستی ئەو ئازادییەی که جولانەوەی کورد له ئێراقدا پێی گەیشت، هەروەها ئەو زیانەی شۆڕشی عەبدولکەریم قاسم به داگیرکەرانی ناوچەکه و دەوڵەته عەرەبیەکانی دەگەیاند، بوونه هۆکار که ئەم دەوڵەتانه دژ

به شۆڕشەکەی عەبدولکەریم قاسم هەڵوێست وەرگرن. ئەم دەوڵەتانە کە ئامادەمان پێکردن لە ڕێگای کورد و عەرەبەکان پەنایان بردە بەر هۆنینەوەی پیلان و گەمەوە. هەندێ لەو دەوڵەتانەی کە لە سەردەمی مەلیک فەیسەڵدا خاوەن بەرژەوەندی بوون و دواتر ئەم بەرژەوەندییەیان لە ئارادا نەما و تێکچوو، لە ڕێگەی پشت بەستن بە هەندێ خێڵی کورد و عەرەب (کە ئەوانیش بەرژەوەندییان لەگەڵ ڕژێمی پاشایەتی بوو) دەیانویست دیسان ڕژێمی پادشایەتی بهێننەوە سەر تەختی دەسەڵات. چونکە بەرژەوەندی ئەم دەوروبەرە لە ڕێگەی عەبدولکەریم قاسمەوە بەدی نەدەهات، ئەمەش شانبەشانی دەوڵەتە داگیرکەرەکان لە لایەن ئەمریکاشەوە پشتگیریی لەو ئۆپۆزسیۆنە دەکرا. لەو سۆنگەوە؛ ئەمریکا نەخشەی کودەتایەکی دژ بە عەبدولکەریم قاسمی دانا کە لە شاری موسڵەوە دەستی پێدەکرد، وردە وردە تەواوی ئێراقی دەگرتەوە. ئەم کودەتایە بەر لەوەی بکەوێتە نێو جموجۆڵەوە پەیوەندییان لەگەڵ کوردان بەست. هەروەها لەگەڵ پەدەکەش کەوتنە نێو پەیوەندی و پێیان گووتن؛ "بە هەموو شێوەیەکی ماددی-مەعنەوی و بە شێوەیەکی چەکداری پشتگیریی لە هەر هەوڵێک دەکەین کە پارتی ئێوە دژ بە ڕژێمی قاسم ئەنجامی بدات". تەنانەت گووتیان؛ "دۆستان و ئەندامەکانتان ڕەوانەی لوبنان دەکەین تا لای حزبی کەتائیبی لوبنان، مەشق و ڕاهێنان ببینن و پەروەردە

بکرێن، هەروەها چەکداریشیان دەکەین". دەیانخواست ئێمەش دژ بە قاسم بکەوینە نێو جموجۆڵەوە.

هەروەکو چۆن ئێمە ئەوەمان پەسەند نەکرد، چووین ئەم پیلانەمان بە عەبدولکەریم قاسم ڕاگەیاند. چونکە بە دڵنیاییەوە ئەم پیلانە تەنیا دژ بە عەبدولکەریم قاسم نەبوو، بەڵکو لە هەمانکاتدا دژی جوڵانەوەی کوردیش بوو. چونکە خێڵ و عەشیرەتە کوردەکانیش بەردەوامییان بە دژایەتیکردنی عەبدولکەریم قاسم دەدا. بەرامبەر بەو کودەتایەی لە موسڵ کە بە ناوی (شەواف[٢]) بەڕێوەچوو پەدەکە و گەلی کورد پشتگیرییان لە عەبدولکەریم قاسم کرد. کاتێک هەلومەرجەکان کەمێک گۆڕانکارییان بە سەردا هات، عەبدولکەریم قاسم ڕێگەی بەوە دا کە پارتی سیاسی لە ئێراق دابمەزرێ. ئێمە هەر لە سەرەتاوە لە نێو هەوڵ و تێکۆشانی ئەوەدا بووین. بۆ ئەوەی پەدەکە بە شێوەیەکی فەرمی ئاوابکەین و وەک نوێنەری گەلی کورد چالاکی ئەنجام بدات، بۆ فەرمیبوون سەرلێدانی دامودەزگا پەیوەندیدارەکانمان کرد، بەڵام حکومەتی ئێراق ئەم داواکاریەی ئێمەی ڕەت کردەوە، پێیان گوتین: "با شاندێکی کۆمیتەی ناوەندی بچێ سەردانی عەبدولکەریم قاسم بکات". لێرەدا شاندێکمان بە سەرۆکایەتی مەلا مستەفا

[٢] عەبدولوەهاب شەواف؛ ئەفسەرێکی نەتەوەپەرستی عەرەب بوو، بەرپرسی سەربازی موسڵ بوو، لە سەرەتای مانگی ئاداری ساڵی ١٩٥٩ لە هەردوو شاری موسڵ و کەرکوک هەوڵی ئەنجامدانی کودەتای دا، بەڵام شکستی هێنا و خۆشی کوژرا.

و چەند ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی پێکهێنا، منیش جێگای خۆم تێدا گرت، حکومەتی ئێراق ناڕازیی بوونی خۆی بەرامبەر بە هەندێ بەشی پرۆگرامی پارتەکەمان نیشاندابوو، لە پرۆگرامدا ڕستەیەکی بەم جۆرە هەبوو "چۆن هەر عەرەبێک بێتە ئێراق دەتوانێ ناسنامەی هاوڵاتێتی بە دەست بێنێ، ئەوا هەر کوردێکیش بێتە ئێراق پێویستە ناسنامەی ئێراقی وەرگرێت". خاڵی دووەمیش کە پەسەندیان نەکردبوو دەگوترا "ئێمە وەک پەدەکە لە ڕێگەی کار و خەباتی دیپلۆماسی مافی تەواوی کوردانی پارچەکانی تری کوردستان بە بنەما دەگرین"، هەروەها وەک پارتی داواکاریەکی ترمان ئەوە بوو حکومەت بە شێوەیەکی فەرمی مافی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردان پەسەند بکات. عەبدولکەریم قاسم بەخۆی نارەزایی بەرامبەر ناوی پارتی دەربڕی و داوای لێکردین لەجیاتی وشەی کوردستان، کوردستانی ئێراق بێت، بەڵام ئێمە هیچ هۆکارێکمان نەدەبینی تا ناوی پارت بگۆڕین. دوای گفتوگۆیەکی درێژ قاسم پێی ڕاگەیاندین؛ "بۆ بەدیهێنانی ئەم ئامانجانەی کە لە پرۆگرامدا دەستنیشانتان کردووە ئازادن لە چۆنێتی بەڕێوەبردنی کار و خەبات، بەڵام نابێ لە دەرەوەی یاسا و دەستووردا بجولێنەوە و ڕەفتار بکەن".

بەمجۆرەش ڕێگەی بەوەدا کە پارتەکەمان ببێتە پارتێکی یاسایی، بۆ یەکەمجار لە مەترۆپۆلێکی دەوڵەتی داگیرکەردا یەکەمین کۆبوونەوەمان ئەنجامدا، ئەوکات مەلا مستەفا لە

ناوچەی بارزان بوو. هەرچەندە داوامان لێکرد بەشداریی ئەم کۆنفرانسەمان بکات، بەڵام پەسەندی نەکرد، وەزیری بەرگری ئێراق داوای لێکردین درێژە بە کۆنفرانسی خۆمان بدەین، ئەوەی ئەم هەواڵەی بۆ ئێمە هێنا وەزیرێکی کورد بوو. بەڵام لە جیاتی ئەوەی فەرمانی عەبدولکەریم قاسم جێبەجێ بکەین، شاندێکمان پێکهێنا و ڕەوانەی لای مەلا مستەفامان کرد. هەوڵماندا ڕازی بکەین تا بەشداری لە کۆنفرانسدا بکات، سەرەڕای ئەو هەموو هەوڵ و تەقەلایانەمان، وەلێ تەنیا بەشداری دانیشتنی کۆتایی کۆنفرانسەکە بوو، لەم دانیشتنەشدا هەڵبژاردنەکانی کۆمیتەی ناوەندی و مەکتەبی سیاسی نوێ بەڕێوەچوو. کاتێ داوامان لێکرد گووتەیەک پێشکەش بکات، بە شێوازێکی زۆر ناشرین گوتی: "من خۆم ناهێنمە ئەو ئاستە نزمەی ببمە سەرۆکی ئەم پارتە، پێم دەڵێن سەرۆکی پارتی، بەڵام جنێوتان پێدابوامایە زۆر لەمە باشتر بوو". بەمجۆرە پارتی بێ واتا بوو، ئەم ئاخافتنەش کۆبوونەوەکەمانی بۆ کاتێکی تر دواخست.

لە ٩ی ئایار بە بۆنەی یادی ڕۆژی دامەزراندنی چیکۆسلۆفاکیا وەک مەکتەبی سیاسی سەردانی کۆنسوڵی چیک مان کرد، عەبدولکەریم قاسم یش لەوێ بوو. هاتە لام و ڕاشکاوانە پێی گووتم: " لەم کۆنفرانسەی ئەنجامتان داوە بە تەواوی پشتگیریی لەو ڕێبازە دەکەین کە تۆ دەیپارێزی، دەزانین چیتان گوتووە"، هەروەها ژمارەی تەلەفۆنی نهێنی

و ئاشکرای خۆی پێدام و پێی ڕاگەیاندم "هەر کاتێک بتەوێ دەتوانی قسەم لەگەڵدا بکەی". من بەشێوەیەکی شۆک و سەرسوڕمانەوە پێشوازیم لە گوتەکانی عەبدولکەریم قاسم کرد، ڕاوێژم لەگەڵ ئەوانەی دەوروبەرم کرد و پێم گووتن؛ بەیانی کۆبوونەوەیەک ئەنجام بدەین، چونکە ئێوارەی هەمان ڕۆژ هەندێک لە هەڤاڵانمان دەیانخواست بچنەوە بەهدینان.

هێندەی لە عەبدولکەریم قاسم تێگەیشتم ئەو تەکتیکەی بەسەر پارتەکانی تردا پیادەی کرد و ئەو دەسکەوت و ملکەچییەی لەوانی بە دەستهێنا، دەیویست بەسەر ئێمەشدا پەیڕەوی بکات. قاسم کەسێکی زۆر تێگەیشتوو و زیرەک بوو، بەتایبەتیش لە چۆنیەتی لەنێوبردن و لێکترازاندنی پارتەکاندا کارامە و وەستا بوو؛ بۆ نموونە حزبی شیوعی ئێراقی کرد بە دوو لەتەوە و یەکێکیانی بە خۆیەوە گرێدا. لەم مەسەلانەدا سیاسەتمەدارێکی وەستا بوو، دەیخواست تەکتیکێکی هاوشێوە بەرامبەر بە ئێمەش پەیڕەو بکات، واتە دەیویست ئێمەش بکات بە دوو پارچە، هەوڵەکانمان بۆ پاراستنی یەکێتی و یەکڕیزی پارتی سەرکەوتنی بە دەستهێنا. بەڵام هەندێ بابەتی تر بەردەوام لە ڕۆژەڤدا دەمایەوە، بۆ نموونە دیموکراسی لە ناو پارتی دا نەبوو، وەلێ بۆ ئەوەی پارتی پارچە نەبێت بە ناچاری هەندێ شتمان پەسەند دەکرد، هەندێکیشمان دژ بەم هەڵوێستە

دەوەستاین و لەم بیر و بۆچوونەدا بووین کە ئەمە کارێکی دیموکراسیانە نییە.

مەلا مستەفا کەسانێکی هەڵبژارد و دەیخواست لە نێو کۆمیتەی ناوەندی پارتیمان جێگەیان پێ بدات، بەڵام دژ بەمە هەڵوێست نیشاندرا و ئەم کەسانە لە ڕیزەکانی پارتی دەرکران، چونکە ئەمانە کەسانێک نەبوون بتوانن ئەم ئەرکە بگرنە ئەستۆی خۆیان و توانای ڕاپەڕاندنی ئەم کارەیان نەبوو، ئەمە لە لایەک، لە لایەکی تریش هەواڵی ئەوەمان پێگەیشت کە مەلا مستەفا پەیوەندی بەو خێڵ و عەشیرەتانەوە کردووە کە دژایەتی عەبدولکەریم قاسم دەکەن و پشتگیرییان لێ دەکات. هەربۆیە ویستم چاوم بە مەلا مستەفا بکەوێ، چونکە دەمویست تێبگەم ئایا ئەم بانگەشانە ڕاستن یان نا؟ کە بینیم لێم پرسی، مەلا مستەفا لە وەڵامدا گووتی؛ "ئەم ڕەوشە لە قازانجی ئێمەدایە و پێویستە ئەم دەرفەتە بقۆزینەوە". هۆکاری ئەوەم لێ پرسی و پێم گووت؛ "بۆچی پشتگیریی لەم خێڵانە دەکەیت؟"، بەم جۆرە وەڵامی دایەوە؛ "عەبدولکەریم قاسم بڕوا بە سەربازەکانی ناکات، دەترسێ کە ئەو چەکانەی بە سەربازەکانی داوە دژ بەو بەکاربهێنرێ، بەمجۆرە بە پشت بەستن بە عەشیرەتە رکابەرەکان هەڕەشە لە عەبدولکەریم قاسم دەکەین و دەتوانین هەندێ ماف و دەسکەوت لە عەبدولکەریم قاسم بسەنین". منیش پێم گووت؛ "نە عەرەبەکان و نە سوپای ئێراقیش عەبدولکەریم قاسمیان

خۆش ناوێت، هۆیەکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەندێشەی ئەوە دەکەن عەبدولکەریم قاسم ئێراق پارچە بکات، چونکە یەکەم جارە ئێراق لە ئاستی سەرۆک کۆمار بە شێوەیەکی فەرمی باس لە مافەکانی نەتەوەی کورد دەکات". هەروەها بە مەلا مستەفام گووت؛ "شێخ و میرە عەرەبەکان تا دوایی ئامادەن ئەم چەکە دژ بە کوردان بەکار بهێنن، واتە دەخوازن دوو ئامانج بە گوللەیەک بپێکن، ئەوان کوردان وەک دوژمنی سەرەکی دەبینن و دەیانەوێ لە ناومان ببەن، چونکە باش دەیانزانی کە عەبدولکەریم قاسم خاوەنێتی لە کوردان کردووە و هەروەها لە نێو حکومەتەکەی خۆیدا جێگەی بە کوردان داوە، کوردەکان پشتگیریی لە عەبدولکەریم قاسم دەکەن". مەلا مستەفا ئەم بیر و بۆچوونانەی پەسەند نەکرد، لە ڕاستیدا ئەم تێڕوانیانە هی من نەبوون، بەڵکو تێڕوانینی پارتی بوون.

دوای ئەوە دیسان مەلا مستەفا گەڕایەوە گوندی بارزان و پەیوەندی خۆی لەگەڵ عەشیرەتە رکابەرەکانی دژ بە عەبدولکەریم قاسم پێشخست و ئامادەکاریەکانی دەستپێکرد. ئێمەش لە لای خۆمانەوە سەردانی حزبی شیوعی ئێراقی و هەندێ پارتی ترمان کرد و کەوتینە نێو هەوڵ و تەقەلادان، بە تایبەتی داوای ئەوەمان دەکرد کە بۆ جێگیرکردنی ئەو مافانەی بۆ کوردان دانی پێنراوە و بڕیاری لەسەر دراوە هەندێ هەنگاوی پراکتیکی بهاوێژرێ. هەروەها کەوتینە نێو دژە هەوڵدانێک بەرامبەر بەوانەی

دژایەتی گەلی کورد و مافەکانیان دەکرد. لە کۆمیتەی ناوەندیدا بە پەسەندکردنی تێکڕای ئەندامان (جگە لە دوو کەس) بڕیاری ئەوەمان دا دژ بە عەبدولکەریم قاسم شەڕ نەکرێت، گووتمان: "شەڕکردن دژ بە قاسم، بە مانای ڕەتکردنەوەی ئەو مافانە دێت کە بۆ گەلی کورد دانی پێنراوە". هەروەها ئەوەشمان ڕاگەیاند کە "بە هەڵگیرساندنی شەڕ بەرامبەر بە عەبدولکەریم قاسم، کۆسپ دەخەینە بەردەم ڕەخساندنی ئەو زەمینە و هەل و مەرجەی بۆ دیموکراسی و ئازادی پێویستە". بەڵام ئەگەر عەبدولکەریم قاسم مەرجەکانمان جێبەجێ نەکات ئەو کاتە شەڕ دەکەین. گووتمان: "داوا دەکەین دیموکراسی پەیڕەو بکات، ئەگەر دژ بە عەشیرەتی بارزانیش شەڕ جاڕ بدات، وەڵام دەدەینەوە". بۆ ئەرێ کردنی ئەم بڕیارەمان، بە شێوەی نامەیەک بۆ مەلا مستەفامان ڕەوانە کرد، ئەویش پەسەندی کرد، تەنیا یەک خاڵی پەسەند نەکرد، ئەویش بابەتی پاراستنی عەشیرەتێکی تربوو.

ئەو کەسەی نامەکەی بۆ مەلا مستەفا بردبوو دەیەوێت بچێتە لای عەشیرەتەکەی تر و مژدەیان بداتێ، بەڵام ڕێکەوتێکی سەیرە، ئەوکاتە کۆبوونەوەیەکی مەزن لە ماڵی ئەو سەرۆک عەشیرەتە هەیە، تەواوی سەرۆک عەشیرەتەکان لەوێن، ئەویش دەیەوێت بڕیاری مەلا مستەفایان پێ ڕابگەیەنێ. بە سەرۆک عەشیرەتەکە دەڵێ: مەلا مستەفا پەیامێکی بۆتۆ ناردووە، پەیامەکەی دەداتێ،

سەرۆک عەشیرەتەکەش نامەیەک لە گیرفانی خۆی دەردەخات و دەیدات بەو هەڤاڵەمان کە نامەکەی ئێمەی بردبوو. مەلا مستەفا لەو نامەیەدا ئەمەی بۆ سەرۆک عەشیرەتەکان نووسیوە: "هیچ کاتێک بڕوا و متمانە بە هەڤاڵانی پارتیم مەکەن، گوێ بە مەسەلەکانی پارتی مەدەن، ئێوە درێژە بە کاری خۆتان بدەن، خوا لە گەڵتانە". لێرەدا ئەو ئەنجامە دەردەکەوێت؛ ئەم جوڵانەوەی دژ بە عەبدولکەریم قاسم سەری هەڵدا هەم دەستی دەرەوەی تێدا هەیە و پشتگیریی لێدەکرێ، هەم لە ژێر کۆنترۆڵی سەرۆک عەشیرەتەکان دایە. ئەوانەش لە بەرژەوەندی تەسکی کەسێتی خۆیان بەولاوە بیر لە شتێکی تر ناکەنەوە.

ویستمان ئەم ڕەوشە هەڵسەنگێنین، وەک هەنگاوی یەکەمین خواستمان قورسایی جوڵانەوە لە شاخ و گوندەکانەوە بۆ شارەکان بگوازینەوە. هەر بۆیە بیرمان لەوە کردەوە بۆ یادکردنەوەی ساڵوەگەڕی کوشتنی پەنجا کوردەکە لە ٦ی ئەیلولی ١٩٦١ خۆپیشاندانێک ئەنجام بدەین، ئەم ڕێپێوانەمان بە سەرکەوتنێکی مێژوویی ئەنجامدرا. هەروەها بۆ هەڵسەنگاندنی ئەو دۆخەی لە ئارادایە کۆمیتەی ناوەندی بڕیاری بەستنی کۆبوونەوەیەکی دا و کۆبوونەوەکە ئەنجام درا. لەم قۆناخەدا ڕژێمی قاسم هەندێ کاری ئەنجامدا کە شیاو و لە جێگای خۆیدا نەبوو، لە کاتێکدا شێخ و ئاغاکان دژایەتی قاسمیان دەکرد، هەندێ لە کرێکار و جووتیارانیش دژ بە قاسم جێگەیان گرت.

کاتێ ئەم ڕەوشەمان بینی گفتوگۆمان لەگەڵ حزبی شیوعی ئێراق و پارتەکانیتر کرد، پێمان ڕاگەیاندن کە پێویستە بەرامبەر بە دەرکەوتنی هەر ڕەوشێکی لە ناکاو ئامادەبین و پێشەنگایەتی بۆ کۆمەڵگە بکەین، بەڵام بە داخەوە هیچ کەسێک وەڵامی پێویستی نەدایەوە و هەوڵ و تەقەلاکانمان مایە پووچ بوو. هەروەها سەبارەت بە مافەکانی گەلی کورد نامەیەکمان بۆ عەبدولکەریم قاسم نارد، هەر وەکو چۆن قاسم لەم لایەنەوە هیچ هەنگاوێکی نەهاوێشت، بە قەدەخەکردنی پارتیمان هەنگاوێکی دژ بە دیموکراسی هاوێشت، تەنانەت هەندێ گرتنیش ڕوویدا، منیش ئەو ماوەیە ناچاربووم خۆم بشارمەوە، چونکە کاردانەوەی قاسم دژ بە من هەبوو، بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە دەستم لە کوشتنی دۆستێکی ئەودا هەیە (کە سەر بە عەشیرەتی خۆشناو بوو) و لە سەردەمی پاشایەتیدا کوژرابوو. هەروەها بۆ داخستنی ڕۆژنامەی خەباتیش بڕیار وەرگیرابوو.

لەم ماوەیەدا گەڕامەوە سلێمانی تا بەشداری لەو کۆنگرەیەدا بکەم کە پێشتر باسمان لێوە کرد. ئەو ڕۆژەی کە گەیشتمە سلێمانی فڕۆکەکانی ڕژێمی عەبدولکەریم قاسم شاریان بۆردومان دەکرد؛ وێڕای ئەوەی شارەکان لە ژێر کۆنترۆڵی ڕژێمدا بوو، بەڵام سلێمانی بۆردومان دەکرد. لە هەمان کاتدا فڕۆکەکانی ئێراق بەیاننامەیان بڵاو دەکردەوە. لە بڵاوکراوەکە ئەوە ڕاگەیەنرابوو کە "ئیبراهیم ئەحمەد و

مەلا مستەفا دژی شۆڕش و حکومەتی ئێراقن". ئێمەش هەندێ لە هەڤالانمان نارد، دەمانخواست لە مەلا مستەفاوە تێبگەین ئەوەی قاسم دەیلێ ڕاستە یان نا؟ لە یەکەم شەڕ و پێکدادانی نێوان هێزەکانی قاسم و ئەو عەشیرەتە کوردانەی لە دەرەوە ئاراستە دەکران، هێزە خێڵەکییەکان بەرگەیان نەگرت و لە مەیدانی شەڕ ڕایان کرد، کاتێ قاسم بینی ئەم خێڵ و عەشیرەتانە شەڕ ناکەن بە دەرفەتی زانی و گوندی بارزانی بۆردومان کرد، ئەگەر عەبدولکەریم قاسم گوندی بارزانی بۆردومان نەکردبووایە، مەلا مستەفا دژی ئەو شەڕی نەدەکرد.

کۆنگرەی پارتیمان لە گوندێکی نزیک شاری سلێمانی ئەنجامدا، داخوازیمان لە پارتەکانی ئێراق کرد بۆ وەستانی ئەم شەڕە لە لایەن عەبدولکەریم قاسمەوە بکەونە نێو هەوڵدان و چاوپێکەوتنەوە، ئەو کاتە عەبدولکەریم قاسم لێبوردنێکی گشتی دەرخست. داوای دەکرد ئەو خێڵ و عەشیرەتە کوردانەی دژی ئەو دەرکەوتوون خۆیان ڕادەستی سوپای ئێراق بکەن، من ئەو کات لە کۆنگرە بووم، ڕێک لەو ڕۆژانە نامەیەکمان لە مەلا مستەفا پێگەیشت، داوای ئەوەی لێدەکردین کە هێزی چەکداری بۆ ڕەوانە بکەین، چونکە دەیگوت ژیانم لە مەترسی دایە، ئێمەش ١٠٠ کەسی چەکدارمان ڕەوانەی لای مەلا مستەفا کرد، گووتمان؛ "ئەگەر عەبدولکەریم قاسم هێرش بێنێتە سەر کوردستان، لە هەر شوێنێکی کوردستانەوە بێ بەرەو

ڕووی دەبینەوە و شەڕ دەکەین"، لە ماوەیەکی کورتدا خۆمان ڕێکخست و تەواوی ناوچە و گۆڕەپانەکانمان خستە ژێر کۆنترۆڵی خۆمانەوە، بە گوێرەی ئەم بڕیارەی سەندبوومان، دەبووایە دوای دوو مانگ لە هەر گوندێک کۆمیتەی پێنج کەسی پێک بێت. ئەم کۆمیتانەش جوتیار و لادێییەکانی ڕێکدەخست و کاروبارەکانیانی بەڕێوە دەبرد. هەروەها دەستەی پێنج کەسی دادگاکانیشمان پێک هێنا. هەر یەکێک لەمانە، بەرامبەر بە بیست و پێنج گوند بەرپرسیار بوو، ئەگەر مرۆڤی تاوانبار و تاوانکار هەبێ سزایان دەدەن. هەروەها دەستەیەکمان پێک هێنا کە سەرقاڵی گشت مەسەلە سیاسیەکان بێت. هەروەها شاندێکیشمان پێکهێنا تا ڕای گشتی دەرەوە ئامادە بکات، ئەرکی ئەم شاندە ئەوە بوو کە ویستی پێکهێنانی دەسەڵاتی خۆییمان بە جیهان بگەیەنێ. ڕۆژ بە ڕۆژ کێشە و گیروگرفتەکانی خۆمان چارەسەر دەکرد و پشتگیریی جەماوەر زیادی دەکرد، تاکە فلسێکمان لە هیچ لایەنێک وەرنەگرت، هەموو شتێکمان ئەوە بوو کە گەل پێی دەبەخشین. تەنیا لە شاری کەرکوک مانگانە ١٦ هەزار دینارمان پێدەگەیشت. لە تەواوی گوندەکانی کوردستان بلاو بووینەوە، پەیوەندیمان لەگەڵ جوتیار و گوندییەکان تا بڵێی باش بوو. کاتێ مەلا مستەفا ئەمەی بیست زۆر توڕە بوو، چونکە مەڵبەندی ئەو لە شوێنێکی تر بوو.

پارتی تریش له کوردستاندا هەبوون، ئەمانە دەیانویست سوپایەک بە ناوی پارتەکانیان دامەزرێنن، ئێمەش پێمان ڕاگەیاندن کە پێویستە هێزێکی سەربازی بە ناوی کوردستان ئاوا بکرێ نەک بە ناوی پارت. هەربۆیە دەتوانن جێگای خۆیان لە ناو هێزەکانی ئێمەدا بگرن، چونکە هێزەکەی ئێمە بە ناوی کوردستانە نەک پارتی. مەلا مستەفا پێنج بارزانی ناردە لامان کە نامەیەکیان لەگەڵ خۆیاندا هێنابوو (ئەمانە بۆ ئەوە باس دەکەم تا پەیوندی نێوان مەلا مستەفا و کۆمیتەی ناوەندی پارتیمان بزانرێ) لە هەندێ مەسەلەدا لەگەڵ مەلا مستەفا ناکۆک بووین و دژی بۆچوونەکانی بووین. ئێمە نەمان دەویست نە حزبی شیوعی ئێراقی و نە پارتەکانی تریش لە کوردستاندا جێگیر بین. ئەو نامەیەی کە ناردرابوو پەسەندمان نەکرد و بە پێنج بارزانیەکەمان گوت بگەڕێنەوە.

نزیکەی بیست کەسێک لەو دوو گوندەوە هاتن کە میوانداری پێنج بارزانیەکەیان کردبوو و گازەندەیان لێدەکردن، پێنج بارزانییەکە فشاریان خستبووە سەر گوندییەکان، ئەوانیش ناچار مەڕیان بۆ سەربڕیبوون، سەرەڕای ئەمەش سووکایەتیان بە لادێییەکان کردبوو. ئێمەش دەستبەجێ هەندێ کەسمان نارد و ئەوانمان بانگ کرد و پێمان گووتن: "پێشمەرگە تەنیا دوو شت لەگەڵ دەخوازێ ئەویش نان و ئاوە، لەمە بەولاوە مافی داواکردنی هیچ شتێکی تری نییە". لە ڕاستیدا لەو ناوچەیە ڕەوشی

پێشمەرگە، زۆر لە دۆخی گوندنشینەکان باشتربوو. لە بنەڕەتدا دیسپلینی ئێمە بۆ ڕزگاری گوندییەکان و تەواوی گەل بوو نەک شتێکی ڕووکەشی بێت. نە سەرۆک خێڵەکان و نە دەوڵەتە داگیرکەرەکان و نە ئیسرائیلیش ئەم سیاسەتەی ئێمەیان پەسەند نەدەکرد.

سەبارەت بەو پەیوەندییانەی لەگەڵ ئێران بەستبوومان عومەر مستەفا "دەبابە" و عەلی عەسکەریمان نارده ئێران. دەمانخواست دژ بە عەبدولکەریم قاسم ئێران پشتگیریمان لێبکات، چونکە عەبدولکەریم قاسم خۆشی دوژمنایەتی رژێمی ئێرانی دەکرد، چاوەڕوانی وەڵامی ئێران بووین، ئێرانیش بەم جۆرە وەڵامی داینەوە؛ "حکومەتی ئێران یارمەتی جوڵانەوەیەکی کۆمۆنیستی نادات، ئیبراهیم ئەحمەد و فەوزی هەردووکیان کۆمۆنیستن، مەلا مستەفاش بێکەسە، ئەگەر دەستبەرداری ئەو فکرەتان بن، ئەو کاتە هەر یارمەتیەکی بیخوازن پێشکەشتانی دەکەین". هەر بۆیە مەلا مستەفا خواستی من بنێرێتە لای شای ئێران و ڕازی بکەم، لە وەڵامدا گووتم؛ هەر شتێک پەسەند دەکەم تەنیا ئەوە پەسەند ناکەم کە بچمە لای شای ئێران، کاتێ ئەم بۆچوونە پەسەند نەکرا، هەم دەستم لە ئەرکی سکرتێری گشتی و هەم دەستم لە ئەرکی کۆمیتەی ناوەندی کێشایەوە، کاتێ زیاتر جەختیان لە سەر کردەوە پێم ڕاگەیاندن کە خۆم لە ئەندامێتی پارتیش دەکێشمەوە، ئەم هەواڵەش بە مەلا مستەفا گەیشت، ئەویش لە ڕێگای

"سالحییەوە" نامەیەکی بۆ ناردم. لە نامەکەیدا نوسیبووی "تۆ گوتبووت ئامادەم گیانی خۆم لە پێناوی گەلدا فیدا بکەم، ئەمڕۆ ئێمە لە قۆناخێکی زۆر زەحمەتداین گەر بێت و ئەو کەسایەتیانەی دەڵێن نیشتیمانپەروەر و کوردم فیداکاری نەکەن، جوڵانەوەکەمان ناتوانێ ئەم ئابلۆقەیە بشکێنێ کە ڕژێمی ئێراق دروستی کردووە و ناشێ سەرکەوتن بە دی بهێنرێ". تەواوی هەڤالانیش سەبارەت بە چوونم بڕیاریان وەرگرتبوو، منیش ناچار بووم بچم.

لە ئێران بە مەڕاسیمەوە پێشوازییەکی گەرم و گوڕمان لێکرا، لەو ماوەیەی کە لە ئێران مامەوە وەزیرێک بە ناوی پاکراسۆن و جێگری سەرۆک وەزیرانیش چاوپێکەوتنی لەگەڵ مندا ئەنجامدا و پێی گووتم؛ "ئێوارە میوانی منی، بە یەکەوە دەچین چاومان بە شا دەکەوێت و دوای گەڕانەوەش دەخۆین و دەخۆینەوە و بە یەکەوە گفتوگۆ دەکەین". لە ژوورەکەی ئەو دانیشتبووین و چەند بەرپرسیارێکی ئاستی بەرزیش لە گەڵمان دانیشتبوون. دەرهەق بە مەسەلەی شەڕ گفتوگۆمان دەکرد، لێی پرسیم؛ "ئەو وتارەی دژ بە شا لە ڕۆژنامەی خەبات بڵاوکرایەوە کێ نووسی؟". لەو سەردەمە ئیحسان نوری پاشا نامەیەکی بۆ مەلا مستەفا ناردبوو. بە تایبەتی بۆ وەڵامدانەوەی ئەو نامەیە سەبارەت بە پەیڕەو کردنی ستەم و زۆرداری بە سەر کوردەکانی ئێران ناردبووی، منیش سێ وتاری بەرفراوان و درێژم لە ڕۆژنامەی خەباتدا بڵاوکردەوە،

دواتر له ئەنجامی لێکۆڵینەوە بۆم دەرکەوت کە نامەکەی ئیحسان نوری پاشا لە هەلومەرجی ئاساییدا نە نووسراوە؟ بەڵکو لە ژێر فشاردا ناچاری نووسین کراوە. لێی پرسیم؛ "ئەگەر شا پرسیار بکات کێ ئەم وتارانەی نووسیوە، چی دەڵێن؟"، منیش لە وەلامدا گووتم: "بە شا دەڵێم من نووسیومە"، گووتی" چۆن هەم بۆ داخوازی یارمەتی هاتیت و هەم وتار دژ بە شا بلاو دەکەیتەوە؟". منیش گووتم؛ "شتێکی سەیر لەمەدا نییە، شا بابزانێ کاتێ کوردێک بکوژێ پشتگیریی لێناکەم، بەلام ئەگەر بۆ ڕزگاری پشتگیریی لە کوردان بکات، ئەو کاتە منیش ڕێزی لێ دەگرم، دوژمنایەتیتان ناکەین، ئێمە دوژمنایەتی تورکان و فارسان ناکەین، دوژمنایەتی ئەوانە دەکەین کە دەمانکوژن و ستەممان لێ دەکەن". دەمویست لێی بپرسم؛ پشتگیریی لە شا دەکات یان نا؟"، لەو کاتەدا بە تەلەفون پەیوەندی لەگەڵ شا بەست.

لەو کاتژمێرانەدا جێگری وەزیری دەرەوەی ئەمریکا لای شا بوو، هەر بۆیە لەگەڵ شای ئێران چاومان بە یەکتر نەکەوت. پازدە ڕۆژ لە ئێران مامەوە، پێیان ڕانەگەیاندم کە شا بانگم دەکات. تەنیا پێیان گووتم؛ "بگرە ئەوە پەنجا پارچە چەک و بیست هەزار دینار" و چاوەڕوانی ئەوەیان دەکرد سوپاسیان بکەم، بەلام لێیان تورەبووم و پێم گووتن؛ "ئەم یارمەتییەی بە پارتیتان بەخشی سەرتان بخوات"، یەکسەر بۆ کوردستان گەڕامەوە.

پارە و چەکەکانم بۆ مەلا مستەفا نارد، لە هەڵویستەکانی ئێران و شای ئێران ئەم ئەنجامەم هەڵێنجا؛ "تا کۆمۆنیستێکی وەک من پەیوەندی لەگەڵ مەلا مستەفا هەبێت یارمەتیدان و پشتگیریی کردنی جولانەوەی کورد زۆر ئەستەم و زەحمەتە. شتێکی لەم جۆرە لە ئارادا نەبوو کە گوێ لە ئێمە ڕانەگرن، بە پێچەوانەوە گوێیان لێ دەگرتین، بەڵام مەلا مستەفا سەدا سەد کەوتە ژێر کۆنترۆڵی شای ئێران، بە تەواوی بووە ماشەیەک. هەروەها لە سەدا پەنجای ئەوانەی گرێدراوی ئێمە بوون کەوتنە ژێر کۆنترۆڵی ئێران.

هەندێ ڕێکخراوی ئێراق پەیوەندییان لە گەڵماندا بەست، دواتر ئەو گرووپانەی گرێدراوی پاشایەتین و لە ئێراق بە پاشایەتیخوازەکان دەناسران، خواستیان ڕێککەوتن لەگەڵماندا ساز بکەن، بەڵام پاشایەتیخوازەکان لەو مافانەی لە سەردەمی پاشایەتی بە کوردان درابوو بەملاوە نەیاندەخواست شتێکیتر بە کوردان بدەن. هەرچی ڕێکخراوەکانیتر بوون دەیانویست هەندێ ماف بە ئێمە بدەن و گفتوگۆمان لەگەڵیاندا ئەنجامدا. ئەمانە ئامادەکارییان کردبوو دژی عەبدولکەریم قاسم بکەونە نێو جموجۆڵەوە. داوایان لە ئێمەش دەکرد پشتگیریی عەبدولکەریم قاسم نەکەین. واتە دەیانویست پشتگیریی گەلی کورد بۆ خۆیان بەدەست بێنن. دەیانگووت؛ "ئەگەر شۆڕشەکەمان سەر بکەوێ بە شێوەیەکی فەرمی مەسەلەی ئۆتۆنۆمی چارەسەر

دەکەین، مەلا مستەفاش دەبێ بە بەرپرسیاری ناوچەی ئۆتۆنۆمی و لە ناو حکومەتدا چوار وەزارەت بۆ کوردان جیا دەکەینەوە". ئەگەر شۆڕشەکەیان سەر بکەوتایە ئاشتی نێوان کورد و عەرەبەکانیش بەدیدەهات.
هەواڵمان بۆ مەلا مستەفا نارد و خواستمان چەند کەسێک بۆ ئەوە دەستنیشان بکات کە لە حکومەتی نوێدا ببن بەوەزیر. دواتر هەواڵی ئەوەمان پێگەیشت کە لە٨ی شوباتی ١٩٦٣ هێزە بە ناو شۆڕشگێڕەکان (نەتەوەپەرستەکان)ی ئێراق لە کودەتای دژ بە ڕژێمی عەبدولکەریم قاسم سەرکەوتنیان بەدەستهێناوە. گوێمان لەڕادیۆی بەغداد ڕاگرت، بەڵام لە بەیاننامەکەیاندا هیچ باسێکی کوردانیان نەدەکرد، تەنیا بروسکەی کەسایەتی ساڵح یوسفی خوێندەوە کە سەبارەت بە پیرۆزبایی کردن لە کودەتاکە ناردبووی. هەربۆیە وەک کۆمیتەی ناوەندی پارتی کۆبوونەوەیەکمان بەست، هەواڵێکمان بۆ مەلا مستەفا نارد و جەختمان لەسەر ئەوە کردەوە کە "پێویستە بە خێرایی شارە کوردنشینەکان بخەینە ژێر دەسەڵات و کۆنترۆڵی خۆمانەوە. ئێمە لەو بڕوایە دابووین کە لایەنگرانی عەبدولکەریم قاسم و هەندێک ڕێکخراوی تریش پشتگیریمان لێدەکەن و دەرفەتی ئەوە دەڕەخسێ شارەکانی کوردستان بخەینە ژێر دەسەڵات و کۆنترۆڵی خۆمانەوە. دەست بە جوڵانەوەیەکی بەم جۆرە دەکەین، ئەگەر مەرجەکانمان پەسەند بکەن پشتگیرییان لێدەکەین و بەم

جۆرە ئۆتۆنۆمی لە کوردستان جێگیر دەکەین، ئەگەر پەسەندیشمان نەکەن لە دژیان شەڕ دەکەین". سەرەتا مەلا مستەفا گوێی لێڕاگرتین و پێی گوتین ئەم مەسەلەیە هەڵدەسەنگێنن، دواتر لە بەرامبەر گەلدا گووتی؛ "ئیبراهیم ئەحمەد سەرەتا داوای لە ئێمە دەکرد دژ بە عەبدولکەریم قاسم شەڕنەکەین، لە عەبدولکەریم قاسم ڕزگارمان بوو، ئیستاش دەخوازێ دژ بە دەسەڵاتی نوێ شەڕبکەین، ئەم داواکاریە هی کۆمیتەی ناوەندی نییە، بەڵکو تەنیا بۆچوونی ئیبراهیم ئەحمەدە". ئەی بۆچی دژ بە عەبدولکەریم قاسم جەنگاین؟ تەنیا بۆ ڕووخانی ئەوبوو؟ بێگومان لەپێناو بەرژەوەندی نەتەوەیی بوو، ئەم هەڵوێستە نێگەتیڤەی مەلا مستەفا بووە هۆکاری ئەوەی کە ئەم دەرفەتە مەزنەمان لەدەست بچێ.

لەم قۆناخەدا دەرفەتی ئەوەمان هەبوو سوپا سۆسیالیستەکانیش بێنینە ئێراق، چونکە ئەوانەی دەسەڵاتیان گرتەدەست بەرامبەر بە کۆمۆنیستەکان گەلێک کوشتاری گەورەیان ئەنجامدا. ئەم لۆژیکە خێڵەکی و شێوازە ئاغایەتییە نەک دەیان جار، بەڵکو سەدان جار بووە هۆکاری لەدەستدان و بە فیڕۆچوونی دەرفەت و چانسی مەزن. بەردەوام لەپێش جوڵانەوەی نەتەوەیی کورد بووەتە کۆسپ و تەگەرە. لەو سۆنگەیەشەوە لە وتارەکەی سەبارەت بە کۆماری مەهاباد نێکیتین گووتەیەکی بەم جۆرەی هەیە؛ "پێویستە شۆڕشگێرانی کورد ئەزموون لە

سەرۆک خێڵە کوردەکان وەرگرن، تا جارێکی تر نەکەونە ڕەوشێکی خراپ و نێگەتیڤانەی بەم جۆرە، واتە لەوان نەچن و هاوشێوەیان نەبن".
لەم قۆناخەدا بانگەوازی حکومەتی ئێراق بۆ مەلا مستەفا هەبوو. لەو کاتەدا مەلا مستەفا کۆنفرانسێکی ڕێکخست، دەیخواست کۆمیتەی ناوەندی بەشداری لە کۆنفرانسەکەدا بکات، لەم کۆبونەوەیەدا داخوازی خۆی بۆ ئەنجامدانی دانیشتن و گفتوگۆ لەگەڵ حکومەتی ئێراق دیارکرد. جەلال تاڵەبانیش یەکێک بوو لە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی ئەوکات، لەم قۆناخەدا مەلا مستەفا چووە بەغداد و لەوێشەوە بەرەو میسر ڕۆیشت. سەبارەت بەم پرسە گفتوگۆیان لەگەڵ جەمال عەبدولناسر کرد.
لەو کاتانەدا لە کۆمیتەی ناوەندی حزبی بەعسەوە نامەیەکمان پێگەیشت، شتی سەیریش لەوەدابوو ئەو کەسەی نامەکەی بۆ ناردبووین چەندین ساڵە لە لایەن گەلی کوردەوە وەک سیخوڕێک دەناسرا، لە لایەن هەرکەسەوە بە پیاوخراپ دەناسرا. ئەوەی نامەکەی بۆناردبووین نوسیبوی؛ "حکومەتی ئێراق لە ١ی حوزەیران هێرش دەکاتە سەر کوردستان، گوندەکان وێران دەکات و هێزەکانی خۆی جێگیر دەکات". ئەگەر هەواڵ و ئاگادارکردنەوەی ئەو کەسە نەبووایە، ئەوا دە هێندەی ئەو زیانەی بەرمانکەوت زیانمان دەبینی. ئێمە لە سەدا نەوەدی کوردستانمان کۆنترۆڵ کردبوو. کاتێک کە حکومەت بینی

کوردان و هێزەکانیان ئامادەکاری دەکەن، ئەویش کەمێک هێرشەکەی خۆی دواخست. هەربۆیە هێرش لە ١ی مانگ ڕووینەدا بەڵکو لە ٩ی مانگ ئەنجامدرا. لەبەر ئەوەی پێشوەخت ئاگادار بووین زیانەکانیشمان کەم بوو. دواتر دەستیان بەسەر کەرکوکدا گرت، سەرەڕای ئەوەی حکومەتی ئێراق بەئامانج و داخوازی خۆی گەیشتبوو، بەڵام شەڕ نەوەستا. تەواوی ئەم ڕووداوانەش لەساڵی ١٩٦٣ ڕوویاندا.

**عەبدوڵڵا ئۆجالان:** ئایا قۆناخێکی نوێ دەستی پێکرد؟

**ئیبراهیم ئەحمەد:** نەخێر. کێشەیەکی تریش هەبوو، عەبدولکەریم قاسم نەما، عەبدولسەلام عارف هات.

**عەبدوڵڵا ئۆجالان:** واتا ئێوە دەتانویاست دەسەڵاتی عەبدولکەریم قاسم بمێنێ و بۆ خۆتان سەربەخۆبن؟

**ئیبراهیم ئەحمەد:** بەڵێ، کاتی عەبدولکەریم قاسم سەربەخۆ بووین. ئەوکاتە دەسەڵاتدارانی نوێ تەلەفونیان بۆ کردین پێیان گووتین؛ "مەرجەکانتان بڵێن". ئێمەش دەمانویست ئەو ڕەوشە هەڵسەنگێنین و بقۆزینەوە. بەڵام دەمانویست پەیڕەوکردنی کوشتاری مرۆڤە پێشکەوتنخوازەکانی دەسەڵات و لێدانی شیوعیەکان بوەستێنین. هەربۆیە جەلال تاڵەبانیمان نارد بۆ ئەوروپا، بەتایبەتیش داوامان لێکرد بچێتە مۆسکۆ. بە ناوبژیوانی ئەڵمانیای خۆرهەڵات پەیوەندی لەگەڵ مۆسکۆ بەسترا. وەڵامی مۆسکۆ بەمجۆرە بوو: "ئەگەر دەخوازن پەیوەندیمان لەگەڵ ببەستن، با

ئەوکاتە ئیبراهیم ئەحمەد بێتەلامان٭. منیش ئەم مەسەلەیەم بە کۆمیتەی ناوەندی ڕاگەیاند، بڕیار سەبارەت بە چوونم بۆ مۆسکۆ درا، منیش خۆم ئامادە کرد.
لە هەمانکاتدا مەلا مستەفا هەواڵی ناردبوو کە بۆ ناردنی سەید عەلی بۆ ئەورووپا یارمەتی بدەین، سەید عەلی وەک نوێنەری مەلا مستەفا دەیخواست پەیوەندی لەگەڵ مۆسکۆ پێشبخات. لەو سەردەمەدا چوون بۆ مۆسکۆ تابڵێی زەحمەت بوو. لە فەڕەنسا چووینە ئەڵمانیا و لەوێشەوە دەربازی مۆسکۆ بووین و بووین بە میوانی پارتی کۆمۆنیستی سۆڤیەت و زۆر بەمە دڵخۆش بووم و شانازیم پێوە دەکرد، پێیان ڕاگەیاندین کە ئامادەن یارمەتیمان بدەن و لە هەمانکاتیشدا وەک حکومەتی سۆڤیەت بۆ چارەسەرکردنی پرسی کورد لە نەتەوە یەکگرتووەکان دەکەونە نێو هەوڵ و تێکۆشان. دوای ئەنجامدانی هەندێک چاوپێکەوتن گەڕامەوە ئەڵمانیای خۆرهەڵات و لەوێدا زانیاری ئەوەم پێگەیشت کە ڕژێمی ئێراق ڕووخاوە، پارت و ڕێکخراوەکانیتریش بە هەماهەنگی لەگەڵ پارتی بەعسدا کەوتبوونە نێو جموجۆڵەوە.

## خەنجەری خیانەت لە کوردستان

لە فەرەنسا لەگەڵ کامەران بەدرخان یەکتریمان بینی، داوای لێکردم بچمە ئەمریکا. دوو نامەی پیشاندام، هەروەها پەیامی هەندێ لە سیناتۆرەکانی ئەمریکاشی تێدا بوو. دوو مانگ پێشتر ئەو نامانەی لەگەڵ خۆیدا هێنابووە پاریس. پێی گووتم: "ئەگەر دەتانەوێ سوود لەو کارانە ببینن، با بەرپرسیارێک بە ناوی پارتی بچێتە ئەمریکا".
کاتێک لە مۆسکۆ بووم، ڕووسەکان پێیان گووتم: "لە پێناو چارەنووس و بەدیهێنانی مافەکانی گەلەکەتان، لە بەستن و پەرەپێدانی پەیوەندی لەگەڵ هەر شوێنێکی جیهان ئازادن، تاکە بابەتێک کە ڕەچاوی بکەن تێکۆشان و بەرژەوەندی گەلەکەتانە". کاتێ لە ئەڵمانیا بووم، پەیوەندیم لەگەڵ ئەڵمانیا، ئەمریکا و ئەڵمانیای ڕۆژئاوا دروست کرد. ئەمریکییەکان ژمارە تەلەفۆنەکەیان وەرگرتین و گووتیان؛ "لە ماوەی پازدە ڕۆژدا وەڵامتان دەدەینەوە".
ڕۆژێک دواتر منیان بانگێشتی کۆنسوڵخانەی ئەمریکا کرد. کۆنسوڵی ئەمریکا ڕاشکاوانە پێی گووتم؛ "لە قۆناخێکدا کە ویستێک هەیە بۆ ئەوەی پەیوەندی لە نێوان کوردان و ئێراقدا دروست ببێ، داخوازی چوونتان بۆ ئەمریکا، زیان بەو پەیوەندییە دەگەیەنێ". واتە گووتیان؛ "ئەگەر ئاڕاستەی گۆڕانکاری و پەرەسەندنەکان بە گوێرەی داخوازیەکانی ئەمریکا بێت، پێویست ناکات بچیتە ئەمریکا، بەڵام ئەگەر بە گوێرەی چاوەڕوانیەکانی ئەمریکا نەبێت، ئەوکاتە دەتوانی

بچیته ئەمریکا". منیش دەستبەجێ چوومە ئێران. لەوێ تەنیا کەسێکم بە ناوی شوکری ئاکرەیی بینی، ئەویش وەک نوێنەری پارتی لە ئێران دەمایەوە. جەمال عەبدولناسر پێی گوتبوو: "من ئامادەم نێوەندگیریی لە نێوان کوردان و ڕژێمی ئێراقدا بکەم". داوایان لە شوکری ئاکرەیی کردبوو پەیوەندی بە پارتی و مەلا مستەفاوە بکات و داواکاریەکانی خۆیان بۆ جەمال عەبدولناسر بنێرن. ڕادیۆی ئێراقیش دەیگوت مەلا مستەفا هیچ کێشەیەکی لەگەڵ ئێراق نەماوە.

کاتێ گەڕامەوە کوردستان بەو ئامانجەی لە ئەنجامی دیدار و چاوپێکەوتنەکانی لەگەڵ حکومەتی ئێراق ئاگادار بین، بە تایبەتی چوومە لای مەلا مستەفا. لەمیانی وەڵامەکانی بۆ پرسیارەکانم، بۆم دەرکەوت کە هیچ ئەنجامێک دەرنەکەوتووە لە بەرژەوەندی گەلی کورددا بێت. مەلا مستەفا دانی بەوە دانا کە لەسەر داوای دەوڵەتێکی گەورە پەیوەندی بە ئێراقەوە کردووە. منیش گووتم: ئەی شەڕکردنیشمان لە دژی ڕژێمەکانی پاشایەتی و عەبدولکەریم قاسم بە داواکاری ئەوان بوو تا پەیوەندی بەستن لەگەڵ ئێراق بە ویستی ئەوان بێت؟ مەلا مستەفا بە توورەییەوە گووتی: "من سەرۆکی کوردان و پارتی و پێشمەرگەکانم، مافی ئەنجامدانی هەر شتێکم هەیە". منیش لە وەڵامدا پێم گووت: "دەشێ خۆت بە سەرۆکی پێشمەرگە و کوردان دابنێی، بەڵام ناتوانی خۆت بە سەرۆکی پارتی دابنێیت. تۆ سەرۆکی پارتی نیت، ئەگەر تۆ لایەنگیریی بکەی، بێگومان بڕیاری ئەوان بەرکار دەبێ". ئەویش هەڕەشەی لێکردم و گووتی: "دەتخەمە بەندیخانەوە".

## به لۆژیکی خێڵەکی سەرکەوتن ئەستەمە

لەمیانی ئەم لۆژیکە عەشیرەتگەراییەوە گەیشتنمان بە سەرکەوتن زەحمەت بوو. ئەگەر لۆژیکی عەشیرەتگەرایی نەبووایە، لەوانەیە سەرکەوتنی زۆر گەورەمان بەدەست نەهێنابووایە، بەڵام ئەگەر شکابووایناشە، ئەوا بە شەڕەفمەندانە دەبوو. بە ئامانجی تاوتوێ کردنی ئەو گفتوگۆ و دەمەقالەیەمان، کۆمیتەی ناوەندی کۆبوونەوەیەکی ڕێکخست. لەو کۆبوونەوەیە بڕیارمان دا مەلا مستەفا لە ئەرکی سەرۆکی پارتی دوور بخەینەوە. هەروەها بەیاننامەیەکمان سەبارەت بە پرسی ڕێککەوتنەکان بڵاوکردەوە. لەو بڵاوکراوەیەدا جەختمان لەسەر ئەوە کردەوە کە مەلا مستەفامان لە ڕیزەکانی پارتی دەرکردووە و پێویستە گوێڕایەڵی لە هیچ فەرمانێکی نەکرێ و ئەو پەیوەندییەی لەگەڵ ئێراق بەستوویەتی خۆبەدەستەوەدانە.

**عەبدوڵڵا ئۆجالان:** لێرەدا دەتوانین شتگەلێکی زۆر سەبارەت بە مەلا مستەفاوە بڵێین، ئەو بابەتەی تا ئێستا باست کردوون ئەوە دەسەلمێنێ کە مەلا مستەفا وەک چۆن سەرۆکایەتی خێڵی دەکرد، بە هەمان شێوەش پارتی بەڕێوە دەبرد، لە ڕاستیدا دەتانتوانی گەلێ کار لەگەڵ دەسەڵاتی عەبدولکەریم قاسم ئەنجام بدەن. بەڵام هەر لە سەرەتای شۆڕش مەلا مستەفا تێکیداوە و پەیوەندی لەگەڵ ئەمریکادا پێشخستووە. هەروەها لە دوا سەردەمەکانی قاسمدا

ڕێککەوتن لەگەڵ "سەیدا ساڵح و جەبار" و کۆمۆنیستەکان پێش دەخات بۆ ئەوەی دەسەڵاتی عەبدولکەریم قاسم بڕووخێنن، لە بنەڕەتدا لاوازی قاسم بە مانای دەسەڵاتی کوردان دەهات. هەروەها فشاری زۆر خرایە سەر قاسم و کرا بە ئامانج، ئەویش هەڵوێستی خۆی گۆڕی، ئەمەش بۆ کوردان شتێکی باش نەبوو، بەم جۆرە عەبدولکەریم قاسمیش لە نێو چوو. ئەوانەیتر هاتن، دیسان مەلا مستەفا نەیدەویست بە شێوەیەکی ڕاست بەڕێوەبچێت و بەڕێوەی ببات. ئێوە دەتان ویست شۆڕش بەرپا بکەن، ئەو تەنیا دەیخواست هەندێک پەیوەندی بەرەو پێش ببات. ئەمەش نەک هەر ئاشتی نەبوو، بەڵکو خۆ بەدەستەوەدان بوو. لە جیاتی ئەوەی هێزەکانی گەورەتر و بەهێزتر بکات، بەردەوام لەناوی دەبات. لێرەدا کاتێک خواستوتانە شەڕ بکەن دژتان وەستاوە، کاتێ خواستوتانە ئاشتی بکەن دیسان لە دژتان وەستاوە. هەڵوێستێکی بەم جۆرە هیچ پەرەسەندن و پێشکەوتنیکی بە ئامانج نەگرتووە. مەلا مستەفا لە ڕووکەشدا خۆی وەها نیشان دەدات کە شۆڕش دەکات، بەڵام لە ڕاستیدا گەڵ چەواشە دەکات و دەیشێوێنێت.

**ئیبراهیم ئەحمەد:** بۆچوونەکانی سەرۆک ئاپۆ لە جێی خۆیدایە و دەست نیشانکردنێکی ڕاستە. پەیوەندییەکانی مەلا مستەفا لەگەڵ حکومەتی ئێراق تەنیا و تەنیا زیانی بە پرسی نەتەوەییمان گەیاندووە.

**عەبدوڵلا ئۆجالان:** پرسێکی وەک بەرقەرازکردنی ئاشتی لەگەڵ دەوڵەت لای ئەو کێشە نییە، بەڵکو بۆ مەلا مستەفا ئێوە خودی کێشەکەن، چونکە ئێوە وەکو هەڕەشەیەک دەبینێ، لە دەوڵەت زیاتر ترسی لە بەرامبەر ئێوە هەیە، هەربۆیە تاکە مەترسی لە ئێوەدا دەبینێت، پێویستە باش لەم خاڵە تێبگەین. دۆخی مستەفا کەمالیش بەم جۆرە بوو، ترسی سەرەکی ئەو لە یۆنانیەکان و ئینگلیزەکان نەبوو، بەڵکو ترسی هەرە گەورەی بەرامبەر بە "ئەدهەم چەرکەس" بوو، چونکە سەربەخۆخوازێک بوو. هەروەها کۆمۆنیستەکان و کوردانیش هەبوون. لە ڕووکەشدا مستەفا کەمالیش شەڕ و ئاشتی دەکرد، بەڵام کاتێک دەسەڵاتی گرتە دەست، کوردان و کۆمۆنیست و بزووتنەوە دیموکراسیخوازەکانی تەسفیە کرد. سەیری مەلا مستەفا دەکەین، ئەویش هەمان شت دەکات.

**محەمەد ڕەسوڵ هاوار:** ئەمە حەقیقەتی مەلا مستەفایە، بەڵام گەل ئەم حەقیقەتە نازانێ، تەنیا چەند هەڤاڵ و هاوڕێیەک مەسەلەکان دەزانن. لێرەدا گەل تاوانبار ناکەم. بەڵام بۆ ڕوونکردنەوەی ڕاستیەکان بۆ گەل بەرپرسیارێتیەکی زۆر دەکەوێتە سەر شانی مامۆستا.

**عەبدوڵلا ئۆجالان:** هەندێک وڵاتپارێز لە باکووری کوردستان هەن تا ئیستاکەش هێندە راستی مەسەلەکان نازانن؛ بۆ نموونە مەسەلەی فایەق بۆجاق هەیە، فایەق بۆجاق سکرتێری گشتی پەدەکەی تورکیا بوو. کوڕەکەی

هاته سەردانمان، تەنانەت ئەوەش نازانێ کە باوکی چۆن کوژراوە. من بۆم ڕوونکردەوە. گووتی: "ڕاستە باوکم بەمجۆرە لەناو چوو"، بەڵام دوای سێ ساڵ توانی ڕاستیەکە تێبگات! لە ڕاستیدا مەلا مستەفا لە مەسەلەی شەڕی چینایەتیدا وەستایە، قازی محەمەدیش هەبوو کە بە بەراورد لەگەڵ مەلا مستەفا، سەرۆکێکی پێشکەوتووبوو، لە لایەنی چینایەتییەوە لەپێشتر بوو. هەربۆیە وەک کۆسپێکی پێش خۆی دەبینێ. بۆیە ئەویش دەیەوێ پارتێک دابمەزرێنێ، واتە ئیرەیی پێ دەبرد و خۆشی نەدەویست، نەیدەخواست قازی محەمەد مەزن بێت و بەرز بێتەوە. هەر لەبەر ئەم هۆکارانە بوو مەلا مستەفا کوردەکانی تورکیاشی خستە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە و نەیدەویست جوڵانەوەیەکی کوردی لە باکووری کوردستان ئاوابێت. نەیدەویست هیچ کەسێک بزانێ پارت و پەیڕەوی ناوخۆی پارت و شەڕی پارتیزانی چییە و فێریان ببێ. دەیخواست تەنیا یەک شت بزانرێت؛ سەرۆک ئەو بە خۆیەتی، خۆی وەک سەرۆکێک سەپاندبوو.

ڕاستە مەلا مستەفا کابرایەکی پیلانگێڕە، بەڵام گێل و غافڵ نییە. لە ڕێگەی پیلانگێڕییەوە کارەکانی خۆی بەڕێوەدەبرد. ئێوە ڕاستگۆ و دڵسۆز بوون، بەڵام ساویلکەش بوون. کاتێ جارێک دوو جار بینیتان کابرا پیلانگێڕیی دەکات داوای حیسابتان لێ بکردایە و حیسابتان لێ بخواستایە.

ڕوون و ئاشکرایە کە نەک تەنیا لە باشووری کوردستان، بەڵکو لە تەواوی کوردستان مەلا مستەفا نوێنەرایەتی عەشیرەتگەریی کۆنەپەرست دەکات. چەند عەشیرەتێکی وابەستەی خۆی کردووە و سەرۆکایەتییانی کردووە. لە ساڵی ١٩٤٥ تا ساڵی ١٩٦٥ درێژەی بە مونافیقێتی داوە. ئێوە خواستوتانە پارتێکی نیشتیمانی- دیموکراسیخواز و هاوچەرخ دابمەزرێنن، ئەم داخوازییەش داخوازی و ڕابوونی مرۆڤی نوێیە، بەڵام کۆسپێکی مەزن هەیە و لە دژی دەوەستێ. مەسەلەکە بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا لەبەر چاوانە. لە ڕوویێکەوە شەڕکردنی دژ بە عەبدولکەریم قاسم بە ئامانجی سووکایەتی پێکردن و ناوزڕاندنی ئێوەیە؛ هەروەها ڕێککەوتنیشی لەگەڵ دەسەڵاتی دواتر بۆ لاوازکردنی ئێوەیە. واتە لە ڕێگەی ئەم هەڵوێستەیەوە دەیەوێ پێتان بڵێ: "هێندە بۆ پێشەوە هەنگاو مەهاوێژن!" هەروەها بە کرداریی پارتی بێ ڕۆڵ و بێ کاریگەر دەکات. ئەم ڕووداوانەی تا حەفتاکان ڕوویانداوە چین و کامانەن، دەتوانن سەبارەت بەمە هەندێ ڕوون کردنەوە و قسە بکەن، هەروەها دەکرێ ئاماژە بە چۆنێتی چوونتان بۆ لای ئێراق بکەن. مەلا مستەفا نەیدەخواست پەیوەندییەکانی لەگەڵ ئێراق، یەکێتی سۆڤیەت و ئەمریکا لەسەر بنەمایەکی ڕاست پێشبخات، بەردەوام شەڕی چینایەتی بەڕێوەبرد، واتە نەیدەخواست شەڕ و تێکۆشان لە پێناو کوردایەتی پیادە بکات. جوڵانەوەکەی مەلا مستەفا جوڵانەوەیەکی

نەتەوەیی نییە، مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد ئەمە دەزانێ. بۆیە لە هەندێ ڕێگە دەگەڕێ؛ دەیانەوێ پەیوەندی لەگەڵ ئێراق پەرە پێبدەن، ڕێگری دەکات، بەرەو مۆسکۆ هەنگاو دەنێ، دیسان ڕێگری دەکات.

لە ڕووی ئەم سەرکردایەتییە بنەماڵەگەرێتی و خێڵایەتییە، سەرۆکایەتیەکی هاوچەرخ و پێشکەوتنخواز لە کوردستان دەرنەکەوت. بێگومان تەواوی ئەم هەوڵدانانەی بۆ ئەوەبوو کە سەرۆکایەتییەکی دیموکراسیخواز و نیشتیمانی پەرە نەسەنێت، بەڵام لە کۆتاییدا خۆشی ژێر دەکەوێت. لێرەدا کوردەکان چییان لە دەستدا؟ کوردەکان نەبوون بە هێزێک و وەکو جاران بوون بە عەشیرەت، لە ڕاستیدا کەوتە نێو ڕەوشێکی زۆر خراپتر. لە نێو کورداندا هزر و ستراتیژیەتێک پەرەی نەسەند؛ نەبوون بە هێزێک و تەکتیکەکانی شۆڕش پێک نەهات. هیچ شتێک بە ناوی پارتی لە ئارادا نەما، ڕێکخستنیش لە ڕێ دەرکەوت و زەبری بەرکەوت. لەو بڕوایەدام کە ئێوە ویستتان گەلێک کار و خەبات ئەنجام بدەن، هەروەها لەم سەردەمەدا خواستتان پەرە بە هەندێ پەیوەندی بدەن و هەندێ دەرفەتیش ڕەخسان، بەڵام دژە پڕووپاگەندەیەکی بەهێزی ئەو دژ بە تۆ لە ئارادابوو: "دەیگوت جاشەکانی ٦٦"، لە ڕاستیدا ئەو بە خۆی لە ڕێگەی پیلانگێڕیی و شێوازیتر بە باشترین شێوە جاشایەتی پەیڕەو دەکرد. هەر هیچ نەبێت تۆ خواستوتە پارتێک لە پێناو کوردایەتی دابمەزرێنیت و شۆڕشێک

ئەنجام بدەیت، واتە لە پێناو بنەماڵە و عەشیرەتێکدا کارت نەکردووە. لەو بڕوایەدام کە ئێوەش عەشیرەتتان هەیە، بنەماڵەیەکی بەم جۆرەشت نەبوو، ئایا لەو بڕوایەدابووی لە ڕێگەی عەشیرەت کارێک ئەنجام بدرێت؟ بە دڵنیابییەوە نەخێر. داخوازیەکانت بە تەواوی لەسەر بنەمای هزری نەتەوەیی، دیموکراسیخوازی و پێشکەوتووخوازی بووە. تێکۆشانی ئێوە ناوەڕۆکێکی نەتەوەیی هەبوو.

لە بارەی قۆناخی یەکێتی نیشتیمانی و جەلال تاڵەبانیشەوە گفتوگۆ دەکەین، بە تایبەتیش قۆناخی دوای ۱۹۷٥. بەڵام سەرەتا با ماوەی نێوان ساڵانی ۱۹٦٥-۱۹۷٥ تاوتوێ بکەین. لە ماوەی نێوان ساڵانی ۱۹۷۰-۱۹۷٥مستەفا بارزانی چیکرد؟ ئێوە ویستتان چیبکەن؟ هەروەها سەرۆکایەتی ئێوە لە ماوەی نێوان ساڵانی ۱۹۷۰-۱۹۷٥ چ مانایەک دەبەخشێت؟ مامۆستا بفەرموون.

**ئیبراهیم ئەحمەد:** کاتێک جیاوازی بیر و بۆچوونی سیاسیمان لەگەڵ مەلا مستەفا زیادی کرد، چەندین کەسایەتی دڵسۆز و نیشتیمانپەروەر کەوتنە نێوانمان و خواستیان چارەسەری بکەن. بە بڕوای من تێڕوانینی مەلا مستەفا بۆ پارتی وەک تێڕوانینی مرۆڤێکی ئاسایی بوو. سەرۆکایەتی خۆی لەسەر بنەمای تاکڕەویی و خۆخۆیی بەڕێوە دەبرد، ئەو بڕیارانەی من لە ناو پارتیدا وەرم دەگرت لە جێی خۆیدا نەدەبینی و پەسەندی نەدەکرد، پارتی لە کەسایەتی مندا دەبینی و بە هیچی دانەدەنا. بە

نێوەندگیریی هەندێ کەسەوە سەردانی مەلا مستەفام کرد، بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشانە داوای بەستنی کۆنگرەیەکم کرد، ئەو کاتە مەڵبەندی سکرتاریەتی گشتی پارتی لە ڕانیە بوو، لەو ڕۆژانەدا ئامادەکارییەکی مەزنمان بۆ کۆنگرە دەکرد. هەڤاڵێکی پارتیمان هەبوو پێی گووتم کە مەلا مستەفا لە بەهدینانە، نامەیەکی پێدام و داوای لێکردم بیخوێنمەوە. لە نامەکەدا نوسرابوو "تەواوی کۆمیتەی ناوەندی کار و خەباتی خۆی بۆ ئەو کۆنگرەیە تایبەت بکات کە لە بەهدینان سازدەکرێت". لێم پرسی بۆچی نامەکەی بە تۆ داوە؟ گووتی کەسی تر بێکار نەبوو، لە لایەکی تریشەوە بۆ ئەوەی خەڵکانێک لە دەوروبەری خۆی کۆبکاتەوە دەیخواست تا ڕادەیەک لە گەڵمدا ڕێکبکەوێ.

لەو کۆنگرەیەی باسم کرد مەلا مستەفا و هەندێ سەرۆک عەشیرەتیش ئامادەبوون، دوای ئەوەی جیاوازیەکانی ناو کۆمیتەی ناوەندیمان خستە ڕوو، مەلا مستەفا گووتی؛ "من بڕیاری ئەوانەم پەسەندە کە لێرە ئامادەن، من دەخوازم ئێوە ئەم کێشانە ( کێشەی نێوان من و کۆمیتەی ناوەندی ) چارەسەر بکەن، هەردوولاشمان ملکەچی ئەو بڕیارانەین کە وەریان دەگرن، دەرهەق بەوەی گوێڕایەڵی و ملکەچیش نەکات دەتوانن بڕیاری لە سەر وەرگرن". پرسیاریان لە من کرد: "بۆچوونی تۆ چییە؟" منیش گووتم؛ "پەسەندی دەکەم و ڕازیم". سەرۆک عەشیرەتەکانیش بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە مەسەلەی سەرەکی کێشەی چەک و پارەیە.

منیش سەبارەت بە بڕی پارە و چۆنیەتی و سەرچاوەی بە دەستهێنانی داوای لێکۆڵینەوەم کرد. کاتێ مەلا مستەفا ئەمەی بیست ڕەنگی زەردبوو و پێی گووتم: "ئیبراهیم شورەییە چۆن دەهێڵی کەسانێکیتر بکەونە نێوانمان". منیش گووتم: "ئێمەش وا بیرمان دەکردەوە کە پێویست ناکات گیروگرفت یان ناکۆکی لە نێوانمان دەربکەوێ". کۆمیتەی ناوەندی نەیدەزانی کە مەلا مستەفا چی دەخوازێت. دەستی گرتم و بە شێوازێکی میانڕەو گووتی: "لە قۆناخی داهاتوو هیچ ناکۆکیەکمان لە نێواندا دەرناکەوێ". ئێمە لە کۆبوونەوە دەرکەوتین، تازە عومەر خەتابی لە ئێران گەڕابۆوە، حکومەتی ئێران ۲۰ هەزار دیناری پێدا بوو تا بیدات بە پارتی، جانتاکەی تەسلیم بە مەلا مستەفا کرد. من گەڕامەوە سلێمانی، ئەوانیش هەریەکە چوونە شوێنی دیاریکراوی خۆیان.

حکومەتی ئێراق دیسان دەیویست پەیوەندی لەگەڵ مەلا مستەفا ببەستێ. داوایان لە من و چەند هەڤاڵێکیتر کرد بچینە بەغداد و لە پێناو دۆزینەوەی ڕێگە چارەیەک بۆ پرسی کورد، چاوپێکەوتن لەگەڵ کاربەدەستانی حکومەتی ئێراق بکەین. ئێمە چووینە شاری ڕانیە، شاندی حکومەتی ئێراقیش هات، سەرۆکی حکومەت و دوو وەزیر لە گەڵیدا هاتبوون. مەلا مستەفاش لەو کۆبوونەوەیەدا ئامادە بوو، مەلا مستەفا پێیانی گووت: "ئەوە ئێوە، ئەوەش ئیبراهیم ئەحمەد". ئێمەی بە جێهێشت و ڕۆیشت، ئەم شاندە ئەو

ئەندامانەی حکومەت بوون کە پێشتر پەیوەندییان لەگەڵ مەلا مستەفا بەستبوو، ئێمەش بەیاننامەمان لە بارەیەوە بڵاو کردبوویەوە کە ئەم پەیوەندییە "لە سەر بنەمای ئاشتییە، یان خۆ بە دەستەوەدان". لە کاتی چاوپێکەوتندا گفتوگۆیەکی بەرفراوان و درێژمان سەبارەت بە داواکاری و مافەکانی میللەتی کورد لەگەڵ ئەم شاندە کرد. بەڵام داواکاریەکانمانیان رەت کردەوە و پەسەندیان نەکرد و بەمجۆرە کۆبوونەوە کۆتایی پێهات.

ئێمە هێشتا لە ڕانیە بووین ئەمانە چوونە لای مەلا مستەفا تا ڕێککەوتنێکی نوێی لەگەڵ ئەنجام بدەن، من گەڕامەوە شوێنی خۆم، دوای چەند ڕۆژێک هەواڵی ئەوەمان پێگەیشت کە مەلا مستەفا لە قەڵادزێ کۆبوونەوەیەکی بەرفراوانی سازداوە. ئێمەش عەلی عەبدوڵلا و سەید عەزیزمان لە کۆمیتەی ناوەندییەوە نارد تا پێی بڵێن: "بۆچی لە کۆبوونەوەیەکی بەمجۆرەدا بە ناوی پارتی ئێمەت بانگهێشت نەکرد"، ئەو دوو ئەندامەی کە ناردبوومان لە لای خۆیەوە دەستگیری کردن. لە سەدا نەوەدی ئەوانەی مەلا مستەفا بۆ ئەم کۆبوونەوەیە بانگهێشتی کردبوون ئەندامی پارتی نەبوون. مەلا مستەفا کۆیکردبوونەوە و هەندێ بڕیاریشیان وەرگرتبوو، بە گوێرەی ئەم بڕیارەی کە دەریان خستبوو گوایە تەواوی کۆمیتەی ناوەندییان لە پارتی دەردەکرد. بۆ دەستنیشان کردنی کۆمیتەیەکی ناوەندی نوێ هەڵبژاردن ئەنجام دەدات و لە هەمان شەودا

کۆتایی بە کۆبوونەوە دێت. دوای چەند ڕۆژێک هەواڵی ئەوەمان پێگەیشت کە مەلا مستەفا لەگەڵ ڕژێمی ئێراق ڕێککەوتووە و هێرشمان دێنێتە سەر و دژ بە ئێمە شەڕ دەکەن.

ئێمەش وەک کۆمیتەی ناوەندی سەبارەت بە چۆنیەتی ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم دۆخە لە خۆمان پرسی پێویستە چی بکەین؟ دژ بە ڕژێمی ئێراق و مەلا مستەفا شەڕ بکەین، یان دەست لە شەڕ بەردەین؟ ئایا پێشمەرگەکانمان سەربەست بکەین؟ ئەوەی دەخوازێ دابنیشێ، ئەوەی دەخوازێ بچێتە لای مەلا مستەفا؟ دەبووایە بڕیارێک بدەین. بۆچوونی تاڵەبانی ئەوەبوو: "دەست لە شەڕی چەکداری بەربدەین"، واتە لایەنگری تێکۆشانی سیاسی بوو. دەیگووت: "ئەگەر حکومەت ڕێگا بە خەباتی سیاسیمان نەدات، ئێمەش وەکو جاران درێژە بە خەباتی نهێنی دەدەین". لە کۆتاییدا ئەو بڕیارەی پێی گەیشتین: بەرامبەر بە مەلا مستەفا و ڕژێمی ئێراق بەرخودان بکەین. لە لایەک سوپای ئێراق شەڕی ئێمەی دەکرد، لە لایەکی تریشەوە مەلا مستەفا و عەشیرەتە هاوپەیمانەکانی دەڤەرەکەیان دژ بە ئێمە شەڕیان دەکرد. هەندێ لەو سەرۆک عەشیرەتانە پەیوەندییان لەگەڵ مندا بەست و داوای یارمەتییان دەکرد بۆ ئەوەی دژ بە مەلا مستەفا شەڕ بکەن. وەڵاممان بەم جۆرە بوو: "ئەگەر هەندێ کەس هەبن بە پارە شەڕ بکەن،

جێگای ئەو جۆرە کەسانە لە نێو ئێمەدا نابێتەوە و پەسەندیان ناکەین".

پێشمەرگەکانمان نەیانتوانی بەرامبەر بە هێزەکانی ڕژێمی ئێراق و هێزەکانی مەلا مستەفا خۆیان لەسەر پێ بگرن و بەرخودان بکەن. لەو هەڤالانەمان پرسی کە جێی خۆیان لە ناو شەڕدا گرتبوو چی بکەین؟ پێشنیازیان کرد بچینە ئێران. بەر لەوان من چوومە ئێران، بابەتەکەم لەگەڵ بەرپرسیاری سەربازی ئەو ناوچەیە چارەسەر کرد، ئەویش زانیاری دا بە تاران، لەوەڵامدا پێیان گوتین: "ئێوە وەک پەنابەری سیاسی پەسەند دەکەین، بەڵام بەو مەرجەی تەواوی چەک و تفاقەکانتان تەسلیم بە ئێمە بکەن و شەست کیلۆمەتر دوور لە چیاکان بوەستن". کاتێ مەرجەکانی ئێرانم بە هەڤالانمان ڕاگەیاند، پەسەندیان نەکرد و ڕەتیان کردەوە. دووبارە چوومەوە لای بەرپرسیارە سەربازییەکان و داوای ئەوەم لێکردن کە چاوم بە بەرپرسیاری ئاستی بەرز بکەوێت، بەمجۆرە کۆبوونەوەیەکمان لەگەڵ بەرپرسیاری سەربازی کوردستان ئەنجامدا. لە سەرەتای ئاخافتنەکانمدا گووتم: "ئەمە پیلانێکە" ئێمە مافەکانی خۆمان لە ئێراق بەدەست دێنین. فەرماندەیەکی ئێرانیش گووتی: "ئێوە لە ئێراقدا ڕێکخستن پێکدێنن و هەروەکو چۆن هەندێ ئاژاوە و گێرەشێوێنیتان لە کوردستانی ئێراق نایەوە، دەخوازن هەمان شت لە ئێرانیش بنێنەوە". ئێمەش پێمان گووتن: "ئەگەر دەخوازن دژ بە ئێراق دەجەنگین و باشووری

کوردستان ڕزگار دەکەین، لە پارچەی خۆرهەڵاتی ژێر کۆنترۆڵی ئێوەشدا دەتوانین شەڕ بکەین". پێی گووتم: "ئەمەی کە ئاماژەتان پێکرد گەوهەری کێشەکەیە". منیش پێم گووت؛ "بەرامبەر بە ئاخافتنەکانی ئێوە سەرم سوڕما؟ گووتەیەکی شا هەیە، لە کتێبەکەیدا دەڵێ: "من شای هەموو گەلانی ئاریم". کوردەکانیش ئارین، ئەم ناوچەیە شوێنی گەلانی ئارییە. ئێمە نامانەوێ پارچەیەک لە خاکی ئێران جیا بکەینەوە، بەڵکو دەخوازین پارچەیەکی تری پێوە بلکێنین". ئەوانیش گووتیان؛ "ئەم هەڵوێستەتان پیلانێکە، دەتانەوێ ژمارەی کوردەکانی ئێران زیاد بکەن و جوڵانەوەی شۆڕشگێڕیی لە ناو کوردەکانی ئێران بڵاوبکەنەوە. دەتانەوێ پەیوەندییەکانمان لەگەڵ تورکیا تێکبدەن، دوای دوومانگ یان ساڵێکی تر ئەو پارچەیەی ژێر دەسەڵاتی تورکیاش ڕزگار دەکەن و دەخوازن بە ئیمپراتۆریەتی ئێرانی ببەستنەوە. ئەمەش دەبێتە هۆکاری شەڕی نێوان ئێمە و تورکیا، ئەگەر بەرامبەر بە تورکیا سەرکەوتنیش بەدەست بێنین، ئەو ئیمپراتۆریەتەی کە پێکدێ نابێتە ئیمپراتۆریەتی ئێرانی، بەڵکو دەبێتە ئیمپراتۆریەتی کوردان. هەربۆیە ئەمانەی کە دەیڵێی خەیاڵە". لە ڕاستیدا ئاخافتنەکانی هی شا بوون و سەربازەکەش بە ئێمەی ڕادەگەیاند. لە ئەنجامدا بە مەرجێک پەسەندمان کرد کە چەکەکانمان تەسلیم بکەین، بەڵام شای ئێران دووبارە چەکەکانمان بداتەوە و بمان نێرێتەوە ئێراق، ئەوانیش

پەسەندیان کرد. من لە تاران مامەوە، ئەو چوارسەد هەڤاڵەی لە گەڵمدابوون بۆ شاری هەمەدانیان بردن. لە دەرەوەی عەلی عەبدوڵلا و سەید عەزیز (کە مەلا مستەفا ئەمانەی دەستگیر کردبوو) ئەوانەیتر هەموویان هاتبوون.

من لە تاران بووم، پەیوەندییەکانی دەوڵەتی ئێران لە گەڵماندا زۆر سەیربوو، هەندێ جار باش و هەندێ جاریش خراپ. خواستیان کۆبوونەوەیەکمان لەگەڵدا ئەنجام بدەن، من بە ناوی کۆمیتەی ناوەندی لەگەڵ بەرپرسیاری سەربازی ئێران لە کوردستان و بەرپرسیاری دەزگای هەواڵگری ئێران (ساواک) چووینە مەهاباد. ئەگەر بڵێم بە باشی و بە گەرمی پێشوازییان لێکردم ڕاست نییە، چونکە ئێمەیان بردە مەیدانی چوارچرا، ئەو شوێنەی پێشەوا قازی محەمەد و هاوڕێکانی تێیدا لە سێدارە درابوون. لەگەڵ دەستپێکی چاوپێکەوتن و گفتوگۆ پێیان گووتین: "ئێوە چی دەخوازن؟"، لە وەڵامدا گووتمان: "دەخوازین مافەکانی گەلەکەمان لە ئێراقدا بەدەست بێنین"، لێیان پرسین: "ئێوە شتێکیش بۆ کوردەکانی ئێران ناخوازن؟!" جەلال تاڵەبانیش پێی گووتن: "ئەو مافانەی ئێراق لە سەردەمی پادشایەتی دانی پێ دانابوو لە ئێوەی دەخوازین، ئێوەش مافی کوردەکانی ئێران بدەن". دواتر سەبارەت بە هەندێ بابەتی تر گفتوگۆمان کرد، گووتیان: "تەواو، ئیتر کۆبوونەوە کۆتایی پێهات". هەڤاڵەکانم گەڕانەوە هەمەدان، منیش چوومەوە تاران.

مانگێک دوای ئەم کۆبوونەوەیە هەموو شتێک دژی ئێمە شکایەوە؛ جەلال ویستی بچێتە ئەورووپا، ئێمەش دەمان خواست بچێت تا شوێنێک و دەوڵەتێکمان بۆ بدۆزێتەوە تا پەنای بۆ ببەین. کاتێک ویستی پاسەپۆرتێک لە ئێران وەربگرێت، پێیان گووت؛ "قەدەخەیە". سەرۆکی ساواک داوای چاوپێکەوتنی لەگەڵ مندا کرد. کابرا تازە ببوو بە سەرۆکی ساواک، منیش لێم پرسی: "هۆکاری ئەم گۆڕانکاریانە چییە؟"، ئەویش بە ڕاشکاوی وەڵامی دایەوە: "لە دوای کۆبوونەوەکەی مەهاباد، تەواوی بەرپرسیارانی ساواک و بەرپرسیارە سەربازیەکان، چووبوونە پیرانشار (خانێ) و لەوێ کۆببوونەوە و دوو ڕاپۆرتیان سەبارەت بە کۆبوونەوەکەی مەهاباد پێشکەش بە شا کردبوو، دوای ئەوەی هەردوو ڕاپۆرتەکەی خوێندەوە، ئەوەی لە جێگای خۆیدا بینی ئێوە بەلاوە بنێ و پشتگیریی لە مەلا مستەفا بکات". تاکە داخوازی مەلا مستەفا ئەوە بوو کە لە لایەن ئێرانەوە دەستبەسەر بین و ڕێگە نەدەن بگەڕێینەوە ئێراق. هەروەها سەرۆکی ساواک لە درێژەی قسەکانیدا گووتی؛ "سەرەڕای ئەوەی لە لای ئێمە پەنابەرن و هیچ شتێکتان نییە، بەڵام داوای مافی کوردەکانی ئێران دەکەن. ئەوە گرنگ نییە مەلا مستەفا خاوەن پارتە یاخود نا، بەڵام هەر کاتێک بمانەوێت لە خزمەتمان دایە. هەروەها وەک ئاگادارین سێ هەزار چەکداری لە هێزی عەشیرەتەکان هەیە. ئێوە وەک مەلا مستەفا خاوەنی هێزیش نین، بە

تەنیان و باشترە لە جێگای خۆتان دانیشن". لێرەشدا زۆر چاک ئەم ڕاستیەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە بۆچی لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا پشتگیریی پەدەکە دەکرێ و متمانەی پێ دەکەن.

لەبەر ئەوەی پێکدادان لە نێوان هێزەکانی بارزانی و دەوڵەتی ئێراقدا دەرکەوتبوو، جارێکی تر ویستمان پەیوەندی لەگەڵ مەلا مستەفا ببەستین. گەڕانەوەی تەواوی هێزەکانمان و هەڤاڵانی پەسەند کرد، تەنیا هی من نەبێت. کاتێک گەڕانەوە بەرپرسیارێتی نەدا بە هیچ یەکێک لە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی و پێشمەرگە و ئەوانی تریش. تەنیا پێی گووتبوون؛ "بڕۆن". جەلال تاڵەبانی و ئەندامێکی کۆمیتەی ناوەندی لە گوندێک دەخاتە زیندانەوە. دوای مانگێک عەباس ئاغا چاوی بە جەلال تاڵەبانی کەوت، مەلا مستەفا پێی گووتبوون؛ "ئیتر ئێوە ئازادن، دەتوانن بچنە هەرشوێنێک کە دەخوازن، ئیتر بەرپرسیارێتی دەرکەوتنتان لەئەستۆی خۆم دەگرم". ئەوانیش گەڕانەوە سلێمانی و سەریان لە حکومەتی ئێراق دا، حکومەتی ئێراقیش پەسەندی کردن. بەم جۆرە ناوی "جاشەکانی ٦٦" یان لێنرا.

دیسان شەڕ و پێکدادان لە نێوان هێزەکانی حکومەتی ئێراق و هێزەکانی مەلا مستەفا دەرکەوت. ئیسرائیل و هەندێک دەوڵەتی دیکە پشتگیرییان لە مەلا مستەفا دەکرد، هەروەها لەم سەردەمەدا ئێمە سامی عەبدولڕەحمانمان لە کۆمیتەی ناوەندی پەسەند نەکرد کە لە ئێراق ڕای کردبوو

و هاتبووه ئێران، ناردمانه لای مەلا مستەفا؛ ئەوشتەی بووه هۆکاری دەرکەوتنه پێشی ئەم کەسه؛ ئەوەبوو کە زمانی ئینگلیزی دەزانی و سەرکێشی بۆ جوولەکەکان دەکرد تا چالاکی دژ بە نەوتی ئێراق لە کەرکوک نیشان بدەن، بەم جۆرە ناوبانگی دەرکرد. لەمە بەدواوەش ئیتر سامی عەبدولڕەحمان (محەمەد عەبدولڕەحمان) لە لای مەلا مستەفا بووه خاوەن پێگە و شوێنێکی تایبەت. شەڕ و پێکدادانی نێوان حکومەتی ئێراق و مەلا مستەفا توند ببوو. لەو قۆناخەدا من لە ئێران بووم، حکومەتی ئێران داوای لێکردم بگەڕێمەوه ئێراق.

ویستمان لەگەڵ مەلا مستەفا بەشێوەی دوو پارتی ڕێککەوتن ئەنجام بدەین و بەرەیەکی کوردستانی پێک بهێنین، بۆیە گەڕاینەوه ئێراق. بەڵام مەلا مستەفا نەیخواست چاوی پێمان بکەوێ و پەسەندی نەکردین. هەموو کەسێک گوێی لێدەگرتین، تەنانەت ئەو پێشمەرگانەی لە مەلا مستەفا ناڕازیی و ناڕەحەت بوون، هاتن پەیوەندییان پێوەکردین. مەلا مستەفا هێرشەکانی خۆی دژی پۆلیس و هێزە سەربازیەکانی ئێراق وەستاند و هێرشی هێنایە سەر پێشمەرگەکانمان، دیسان هەندێ کەسایەتی نیشتیمانپەروەر کەوتنە ناوبژیوانی کردنمان، پێمان گووتن؛ "لە هەموو ڕەوشێکدا ئامادەین بگەڕێینەوه لای مەلا مستەفا، تەنیا بە مەرجێک شەڕ دژی ئێمە نەکات". بەڵام ئەوەشی پەسەند نەکرد، بەڵکو دژی ئێمە سەنگەری گرت. لەم قۆناخەدا

عەبدولڕەحمان عارف دانی بەهەندێک مافدا نابوو. دوای ئەوە بەعسیەکان کودەتایەکیان کرد و دەسەڵاتیان گرتە دەست، تەنیا خۆیان (حزبی بەعس) بوون بە دەسەڵات.
پێویستە ئاماژە بەو خاڵەش بکەم، لەم قۆناخەدا کاتێک لە بەغداد بووم جێگای خۆم لەناو حکومەتدا دەگرت. شاندێکی وەزارەتی بەرگری کوێت بە سەردان هاتنە ئێراق، دەیانخواست پەیوەندی لەگەڵ ئێراق ببەستن. لە کاتی پێشوازی لێکردنیان منیش ئامادەبووم، ئەحمەد حەسەن بەکریش لەو کۆبوونەوەیەدا ئامادەبوو، دوای کودەتای ساڵی ١٩٦٣ سەرۆکی حکومەت بوو، هەروەها چەند کەسێکی تریش ئامادەبوون. ئەحمەد حەسەن بەکر پێی گووتم؛ "ئێمە هەردوو پارتی بەعس وەک نوێنەری گەلی عەرەب و پارتی ئێوەش وەک نوێنەری گەلی کورد با یەک بگرین و بەرامبەر دوژمنەکانمان بووەستین". واتە دژی لایەنگرانی پادشایەتی یارمەتی و هاوکاری دەخواست. دواتر من و جەلال تاڵەبانی لەگەڵ گرووپێک چووینە سەردانی ئەو سەرکردانەی شۆڕش (کودەتا)کەیان ئەنجامدابوو، داوامانکرد چاومان بە سەرۆک کۆمار بکەوێت، چاوپێکەوتنەکەمان کرد. (بۆ ئەوەی سەددام حسێن و بەعسیەکان بناسن، دەمەوێ ئاماژە بە هەندێ شت بکەم)ز کاتێک چووینە ژوورەوە سەرۆک کۆمار پێشوازی لێکردین و دەستێکی لەسەر شانی من و دەستەکەی تری لەسەر شانی جەلال تاڵەبانی دانا. پێی گووتم؛ "تۆ برای

ئێمەی، بیروبۆچوونەکانی خۆتمان پێشکەش بکە". مەسەلەکە تێگەیشتم. دوو ڕۆژ بەر لە "شۆڕش" کۆبوونەوەیەکیان هەبوو لەوێدا گفتوگۆیان سەبارەت بە مەلا مستەفا و کوردەکان کردبوو، جەلال سووکایەتی (بە بەعسییەکان) کردبوو. وێڕای ئەمەش سەرۆک کۆمار ئەوەی لە بەرژەوەندی خۆیان بینی کە بەشێوەیەکی باش ڕەفتارمان لەگەڵدا بکەن. بێگومان ئەمە بە مانای نەرم بوونیان نەدەهات، بەڵکو دەیانخواست دەسەڵاتی خۆیان بپارێزن. ڕاشکاوانە پێیان گووتین؛ "ئەگەر ئەمجارە لە دەسەڵات بکەوین، هەتا منداڵەکانیشمان بە نێو ڕەشەکوژیدا دەربازدەکرێن. هەر بۆیە سوورین لە سەر ئەوەی دەست لە دەسەڵات بەر نەدەین". کاتێ کۆبوونەوە تەواو بوو چووینە دەرەوە، دوو کەس لە سەر کورسی دانیشتبوون، یەکێکیان جلی سەربازی پۆشیبوو، پێیان گووتین؛ "ئەوە سەددام حوسێنە". لە کۆشکی سەرۆک کۆماردا گەڕام و ژوورێکی چۆڵم بینی و واقم وڕما، پێیان گووتم: دەزگا و بێ تەلی تایبەت لێرە دانراوە، ڕاستینەی بەعس ئەمە بوو، کە گرێدراوی ئەمریکا بوون. دوای ئەوەی ئەمریکا بەعسیەکانی کرد بە دەسەڵات، لە ساڵی ١٩٦٩نوێنەری یەکێتی سۆڤیەت هاتە بەغداد، یەکێک لە ئەرکەکانی ئەوە بوو، کۆتایی بە شەڕی نێوان مەلا مستەفا و حکومەتی ئێراق بێنێ، پەیوەندی لەگەڵ ئێمەش بەست و پەسەندمان کرد. سەرۆک کۆمار سەبارەت بە بابەتەکە گفتوگۆی

لەگەڵدا کردین. منیش تەنیا یەک داواکاریم لێکرد و پێم گووت: "چی بە کوردان دەبەخشن، ئێوە ئامادەنە بەیاننامەیەک دەربخەن و مافەکانی گەلی کورد ڕابگەیەنن، تا کوردانیش بە مافی خۆیان بگەن. لە مەلا مستەفا و دار و دەستەکانیشی ببوورن و لە گەڵیدا ڕێکبکەون". بەڵام ئەم بۆچوونەی منیان پەسەند نەکرد.

دوای ئەوە من نەخۆش کەوتم، ویستیان لە نەخۆشخانە دەرمبخەن و بمنێرنە لەندەن. کاتێ خواستیان بمنێرن سەددام حسێن لەبەر دەرگا وەستابوو و گوڵێکی بە دەستەوە بوو و پێشوازی لێکردم. کاتێ گەیشتمە لەندەن کۆنسوڵی ئێراق لە لەندەن چاوەڕوانمان بوو. ماوەیەک لەوێ مامەوە، ڕۆژانە کۆنسوڵی ئێراق سەردانی دەکردم. دەیخواست ساتێ زووتر چاک ببمەوە، چونکە گفتوگۆکانیان لەگەڵ مەلا مستەفا گەیشتبووە قۆناخێکی زۆر هەستیارەوە، دوو ڕۆژ دواتر گفتوگۆ و چاوپێکەوتنەکان کەوتە سەر ئاراستە و ڕێڕەوێکی باشەوە (ئەمە ساڵی ١٩٧٠ بوو).

مانگێک دوای ئەوە پیاوێک لە ئێرانەوە هاتە لام، سەر بە دەزگای هەواڵگری ئێران بوو. لە پاریس یەکترمان بینی و شای ئێران ناردبووی، گووتی: "دەخوازین ئەم هەڵە و کەم و کورتییانە ڕاست بکەینەوە کە دەرکەوتوون، مەلا مستەفا خەڵەتێنراوە، دەخوازێ تۆش بکات بە پیاوی خۆی". لە وەڵامدا گووتمان: "بۆچی شای ئێران وا دەکات؟ با ئێران دان بە هەندێ مافی کوردان دابنێ، ئەو مافانەی بەعس بە

کوردی داوه ڕێگا و ڕەوایەتی بە کەس نادات شەڕ لە دژی بەعس بکات، ئەگەر دەتانەوێ یارمەتی کوردان بدەن دان بە مافەکانیان دابنێن، کۆیلایەتیتان بۆ ناکەین". بۆ ئەوەی لە ڕاستی و ناڕاستی قسەکانی ئەو پیاوە تێبگەین داوامان لە هەڤاڵمان سەید عەلی کرد بێتە لامان، چونکە ئەو لە ئێران دادەنیشت. لەبەر ئەمەش بوو بانگی تاڵەبانیمان نەکرد.

ئیتر ڕژێمی ئێراقیش حیسابی بۆ دەکردین و گوێی لێدەگرتین، دەمانویست لەگەڵ مەلا مستەفا ئاشت بینەوە، ئەو کاتە کۆمیتەی ناوەندی پارتەکەی مەلا مستەفاش لێدوانیان دەدا و بە ئاشکرا دەیانگوت: گرێدراوی ئێراقین، دەیانگووت کاتێک ململانێ و پێکدادان کۆتایی پێهات، ئەو کاتە نوێنەرایەتی خۆیان دەکەنەوە. مەلا مستەفاش دەیخواست لە گەڵماندا ئاشت بێتەوە، بە گوێرەی بۆچوونی ئەو دەیگوت: ئەگەر ئیبراهیم ئەحمەد نەبێ ئاشتیش نابێ. منیش گەڕامەوە ئێراق، کۆبوونەوەیەکمان بەست، بڕیاری دەستپێکردنی کار و چالاکیمان وەرگرت. ناوی پارتیمان گۆڕی، گووتمان با بچینە نێو بەرەی مەلا مستەفا. بەڵام تەنانەت دوای دوو ساڵ لە یەکگرتنەوەشمان لە سوکایەتی پێکردن بەملاوە هیچ شتێکی ترمان نەبینی، بەمجۆرەش پێمان نایە ساڵی ١٩٧٢.

## مەلا مستەفا لایەکی مێشکی کوردانی پووکاندەوە شیوعیەکانیش لایەکەی تر

**عەبدوللا ئۆجالان:** مەلا مستەفا پێشمەرگەکانی ئێوەی بۆلای خۆی ڕاکێشا و ئێوەش وەک بینەرێک بێدەنگ مان، دوای ئەوە چی ڕوویدا؟ بارزانی لە ساڵی ۱۹۷٤ بە ئامانجی خۆی گەیشت، ئێوەش جیا بوونەوە و بەم شێوەیە مانەوە. لە ساڵی ۱۹۷۰ بە دواوە ئیتر بە مانایەک لە ماناکان جوڵانەوە کۆتایی پێدێت. تا ساڵی ۱۹۷٤ بەعسیەکان چییان لەگەڵ مستەفا بارزانی ئەنجامدا؟ لەم ماوەیەدا چ ڕێککەوتنێک ئەنجامدرا؟ بە تایبەتی لە ماوەی نێوان ساڵانی ۱۹۷۰-۱۹۷٥ خواستتان چی بکەن؟ چۆن و بە چ شێوەیەک مەلا مستەفا بووە کۆسپ؟ بۆ ئەوەی دەستکەوتەکانتان بکات بە موڵکی خۆی لەگەڵ ئێراق ڕێککەوت، ئەم ڕاستیەش لە ساڵی ۱۹۷٤ ڕوونتر بوویەوە. بەڵێ لە ساڵی 1975یش دەستی لە هەموو شتێک بەردا و ڕایکرد. واتە ئێوەشی لەنێو برد و ئیفلیجی کردن. سیاسەتمەدارانی کورد و ئێوەی ڕۆشنبیران دەتانخواست هەندێ شت بکەن، بەڵام هێزی شیکردنەوەتان لاوازبوو، سەبارەت بە مەسەلەی بنەماڵەی مەلا مستەفا تا ئێستاش هەڵە و لاوازیەکانتان بەردەوامە.

حزبی شیوعی ئێراقی تا ئێستاکەش وەکو رابردوو بەردەوامە و لەسەر هەمان هەڵە بەڕێوەدەچێ. من هیچ

شتێک سەبارەت بە ڕێبازەکەتان ناڵێم، بەڵام لە کاتی خۆیدا هەڵویستی پێویست و گونجاوتان نیشان نەدا و لە حەقیقەتی مەلا مستەفا و بنەماڵەکەی تێنەگەیشتن، هەر بۆیە هەموو شتێک لە دەست دەدەن. خۆتان تەسلیمی مەلا مستەفا کردووە. تەنیا بۆ یەک کاتژمێریش بێ نابێ مرۆڤ خۆی تەسلیم بکات. بەڵام چۆن و بۆچی ئێوە تەسلیم بوون؟ تێناگەم.

**ئیبراهیم ئەحمەد:** پێویستە لەسەر ئەوە بووەستین کە بۆچی تا ئێستا جوڵانەوەکانی کوردان سەرکەوتنیان بەدەست نەهێناوە.

**عەبدوڵلا ئۆجالان:** نابێ تەنیا بڵێین خێڵایەتی و بەسەریدا تێپەڕین. تەنانەت لە ناو پەکەکەشدا تێکۆشانێکی دژوارم دژی خێڵایەتی بەڕێوەبرد. ئەوەی ئێوە باسی لێوە دەکەن زۆر لە مێژە لە لایەنی منەوە وەڵامی دراوەتەوە. خاڵێک کە بخوازن بپرسن فەرموون، بۆچی مەلا مستەفا وای کرد؟ لە ڕاستیدا خەتا هی ئێوەیە؟ ئێوە ئەی کۆمۆنیستان و ڕۆشنبیرانی باشووری کوردستان بۆچی ڕێگەتان لە مەلا مستەفا نەگرت و نەبوونە ڕێگر؟

**ئیبراهیم ئەحمەد:** ئێمە بەردەوام لە گۆشە نیگایەکی نەتەوەییەوە سەیری پرسەکەمان دەکرد.

**عەبدوڵلا ئۆجالان:** ئەمەیان زۆر گرنگ نییە، نابێ مەسەلەکان زۆر بە سادەیی و ئاسایی تاوتوێ بکەن، باش دەزانن کە ویستیان ئێمەش بخەنە نێو پیلان و گەمەی

خۆیانەوە. هەڵوەستەیان لەسەر هەڤاڵێک کردبوو، لە میانەی چاوپێکەوتنەکانەوە دەیانویست بیخەنە ژێر کاریگەری خۆیانەوە. بینیم دەخوازێ تەسلیمی بارزانیمان بکات، واتە ئەویان بۆلای خۆیان ڕاکێشابوو. ناچار بووم دەستێوەردانم کرد، بەرامبەر بەم ڕەوشە هەڵوێستێکی زۆر توندم نیشاندا، بۆیە رایکرد، کاتێ ڕای کرد دەی گووت؛ "پەکەکە لەناو دەچێت و هەڵدەوەشێتەوە". هەروەها هەڤاڵێکی ترمان هەبوو کە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی بوو، دەچێ لەگەڵ ئیدریس بارزانی چاوپێکەوتن دەکات. هاتە لامان و گووتی؛ "ڕێککەوتنمان بەست". منیش گووتم زۆر باشە. ئیدریس دەیویست ئێمەش رابکێشێ، دەیگووت؛ "وەرن ئێوە باشوور چارەسەربکەن، وەرنە دەڤەری بارزان". ئەمەش تەنیا بۆ ئەوە بوو، هێزەکانمان بکەونە خزمەتیانەوە و بەگوێرەی خۆیان بەکاریان بهێنن، بۆیە هەڤاڵانمان هەن شان بەشانی ئەوان جەنگاون و شەهید بوون.

کە هەڤاڵان هاتن و ڕەوشیانیم بینی، تێگەیشتم کە بارزانی دەیەوێ کاریگەرییان لەسەر بکات. بەڵام کاتێک سیاسەتێکی سەربەخۆ و بە ئیرادەمان پەیرەو کرد، یارمەتییان نەداین. لە نیازی کوڕەکانی مەلا مستەفا تێگەیشتم. ئەمانە لە کوردستان گەورەترین هەڕەشە و مەترسی شەڕی چینایەتین. ئەم واقیعەم دەستنیشان کردبوو. بەڵام هەڤاڵانمان ئەم ڕاستیەیان بەرچاو نەگرت و زۆر هەڵەیان دەکرد. بەردەوام دەچوونە لایان تا دۆستایەتی بکەن و

ڕێککەوتنیان لەگەڵدا ئەنجام بدەن. هەربۆیە زۆر باش مەسعود بارزانی دەناسم. ئەگەر هەندێ تەدبیرمان پێش نەخستبووایە، ئەوا ئێمەشیان لەناودەبرد. بەڵام پەکەکە سیاسەتێکی سەربەخۆ و ئاقڵانەی بە بنەما گرت، بۆیە بەو ئامانجەیان نەگەیشتن. مەسعود وایکرد هەموو کەسێک هێرشمان بێنێتە سەر، بەڵام ئێمە شەو و ڕۆژ هەوڵماندا گەمە و پیلانەکانیان پووچەڵ بکەینەوە. بۆچی نەکەوتین؟ چونکە تاکتیکەکانیمان پووچەڵ کردەوە و هێدی هێدی هێزەکەمان مەزنبوو و لە باشووری کوردستانیش کاریگەریمان زیادی کرد.

هەروەها لە لایەکی ترەوە وامانکرد سیاسەتەکانی بنەماڵەی بارزانی لای ئەمریکا، لەندەن، ئێران و تورکیا بێ ئاکام بێت، هەروەکو بڵێی هەموو لایەکمان لێگرت و خنکاندمان. ئاستەنگ کردن و ڕاوەستاندنی خراپەکاریی و سیاسەتەکانیان کارێکی وا ئاسان نییە. لە دوژمن زیاتر هەڵوەستە لەسەر ڕەوشی مەسعود بارزانی دەکەم. بەڵام ئێوە سەرەڕای ئەوەی خۆتان کردووە بە هێزێک، بەڵام مەلا مستەفاتان بۆخۆتان کرد بە کۆسپێک. ئێوە هەرچیەکتان کردبێت، دەستی بەسەردا گرتووە. مادام ئەو لە ناوت دەبات، تۆش ئەو لەناو ببە. هەروەها بە نیازێکی پاکەوە داوای ڕێککەوتن دەکەن، بەڵام کە شیکردنەوەیەکی ڕاست بۆ بابەتەکە ناکەن، کابرا تەسفیەتان دەکات. هەڤاڵانی ئێمەش وایان کرد، بەڵام ئاگادارم کردنەوە و پێیانم گووت؛

"بە هیچ جۆرێک بەم شێوەیە نابێ، چونکە زیانتان بەردەکەوێت".
پێویستە زۆرباش لەم ململانێ و شەڕە تێبگەین کە لە نێوان ئێمە و مەسعود بارزانیدا هەیە، لەو بڕوایەدام کە تا ئێستاکەش بە تەواوی دەرکی پێنەکراوە. بە تایبەت مام جەلال دەیەوێ هەندێک تاکتیک پەیڕەو بکات. بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەی بنەماڵەی بارزانی چۆن تەکتیکی ڕاست و دروست پیادەبکەین؟ پێویستە زۆر بە باشی بیناسین، هەروەها هەستیار و هۆشیاربین. هەروەکو گووتم؛ خەتا هی ئێوە بوو، چونکە لە کاتێکدا ئێوە سەرۆکی پارتێکن، ئەو سەرۆک خێڵێکە، بەڵام ئێوە دەیکەن بە بەرپرسیار و سەرۆکی خۆتان. بیست - سی ساڵ، بەردەوام بڕیارەکانتان بەلاوە دەنێ و جێ بەجێی ناکات. سەرۆک بەم جۆرە نابێت؟ لەکاتی شەڕکردندا گووتوویەتی؛ "وەرن لێم نزیک ببنەوە"، وەکو منداڵ شتێکی پێ بەخشیون و دیسان ئێوەی خەڵەتاندووە. ویستیان هەمان شت بەرامبەر بە منیش پیادە بکەن. ئەوەی سی چل ساڵە بەرامبەر بە کوردان ئەنجامی دەدات، خواستی بەرامبەر بە منیش بیکات؛ مەسعود بارزانی پێی گووتم؛ "وەرە مەسیف سەلاحەددین و لە لای من بمێنەوە". زۆر چاک دەزانم لە ڕێگەی ئەم تاکتیکەوە کابرا دەیەوێ پیلانێکمان بەسەردا پەیڕەو بکات. نەک بەرامبەر بە من، بەڵکو هێزی ئەوەی نییە شتێکی بەمجۆرە بەرامبەر بە هەڤاڵانی ئەندامانی

کۆمیتەی ناوەندیشدا پەیڕەو بکات کە لە ناوچەکە دەمێننەوە. چونکە ڕێکار و تەگبیری پێویستم وەرگرتووە و سەری داوەکەش بەدەستی خۆمەوەیە. هەربۆیە پازدە ساڵە نەیتوانی شتێک بەرامبەر بە ئێمە بکات. ئێستاش شتی گرنگ ئەوەیە بە ئەنجام بگەین.

**ئیبراهیم ئەحمەد:** ناکۆکیەکانی ئێوە لەگەڵ بنەماڵەی مەلا مستەفا نوێیە، هی ئێمە بۆ سەردەمێکی کۆن دەگەڕێتەوە.

**عەبدوڵلا ئۆجالان:** لە ململانێ و تێکۆشان بەرامبەر بنەماڵەی مەلا مستەفا چ ئەنجامێکتان بەدەست هێنا؟

**ئیبراهیم ئەحمەد:** هیچ شتێک، تەنیا وەک ئێوە بەرخودانمان کرد.

**عەبدوڵلا ئۆجالان:** هەر هیچ نەبێ ئێمە بەرخودان دەکەین، بەڵام ئێوە پەرێشان بوون، لە نێو چوون. ئەمە دۆخێکی زۆر خراپە. ئێمە وامان کرد بەرامبەرمان چۆک دابنێن، شەڕ و تێکۆشان ئەم پیاوە دێنێتەوە سەر ڕێ.

**ئیبراهیم ئەحمەد:** مەسەلە لە چەکدا نییە، بەڵکو مەسەلەکە لێک تێگەیشتن و چەمکی هەردوو لایەنە.

**عەبدوڵلا ئۆجالان:** مەسەلەی سەرەکی لە ڕێگەی چەکەوەیە، بۆچی مەسعود بارزانی لەنێو نەچوو؟ چونکە بارزانی ڕۆحێکە، لە هەمانکاتدا کولتورێکە. لە ناو گەلدا بووەتە دابونەریتێک. ئەم شەڕەش شەڕی هەموو کوردێکە. لە ڕاستیدا بەرلەوەی شەڕ دەست پێبکات گوایە مەسعود بارزانی دەیخواست بۆ دواوە هەنگاو بهاوێژێ، چونکە

شێوازی شەڕی ئێمەی بینیبوو و دەترسا، گوایە بەر لە شەڕ دەیخواست سازشکاری بکات، بەڵام هەرچەندە مەسعود بخوازێ سازشکاری بکات، ئەمە پەسەند ناکەین، چونکە ئەوەی ئێمە سۆز و پەیمانێکە، پەیمانێکی هەزاران ساڵەیە. ئەو هەرچەندە تەنازوول بکات، پەسەندی ناکەین، پێویستە تێکۆشان دژ بە خیانەت بە ئەنجام بگات. واتە ئەمڕۆ تا ڕادەیەکی مەزن لەسەر پەکەکە دەوەستن و هەڵوەستەی لە بارەوە دەکەن. بەڵام ئێمە وەکو مەسعود بارزانی ناکەین، شێوازی تێکۆشان و شەڕکردنمان زۆر جیاوازە. نە باکوور و نە باشوور سەری لەم شێوازە دەرناچێت و لێی تێناگات، ئێوەش شتێکی لێ تێناگەن، هەربۆیە پێشتریش ئاماژەم بۆ کرد و گووتم؛ پێویستە بە شێوەیەکی قووڵ و چڕ و پڕ هەڵوەستە بەرامبەر بەم شەڕەی دوایی بکەن.

ڕەوشمان بەرامبەر بە پەدەکە باشە. دۆخی گشتی و سەربازیمان باشە، لە لایەنی ئابووری (دارایی)یشەوە کێشەیەکی وا جددیمان نییە. بەڵام تا کێشەی بنەماڵەی بارزانی چارەسەرنەکرێ، بە هیچ جۆرێک ڕەوشی وڵاتمان کوردستان باش نابێت. هەربۆیە دەڵێم؛ چەند ساڵێکە شەڕ و تێکۆشان بەڕێوە دەچێت و تا ئێستا کەسێک نییە ئەنجامی مەزنی لێ هەڵهێنجابێ. هەندێ پارت و کەسایەتی جیاواز هاتنە سەردانمان، لێیان پرسین: پارە هەیە یان نا؟ منیش پێم گوتن؛ "بڕۆن". لای ئەوان مەسەلەی هەرە گرنگ پارەیە.

ئەم کێشەیە هەموومانی سەرقاڵ کردووە، ئەمە تەنیا کێشەی پەکەکە نییە، بەڵکو کێشەی تەواوی کوردانە. بۆچی لە بەیانییەوە گوێمان بۆ ڕاگرتوون؟ چونکە ئەزموونێکی گەورەتان هەیە.

**ئیبراهیم ئەحمەد:** من ویستم مەلا مستەفا بکەم بە پردێک و تا دوایی لە شەڕی دژ بە داگیرکەران بەکاری بهێنم.

**عەبدوڵلا ئۆجالان:** مەزن کردنی مەلا مستەفا بە دەستی شای ئێرانەوەیە. تورکیاش دژی ئێوە شەڕی پیادە کردووە و پەیوەندییەکانی مەلا مستەفا لەگەڵ تورکیا زۆر باش بووە. تۆ هیچ باسی ئەم مەسەلانەت نەکرد، پەیوەندییەکانی لەگەڵ تورکیا گرنگە. بۆ نموونە، بەعسیەکان دەبن بە دەسەڵات، دێنە بەردەستی ئێوە، دەخوازن لەگەڵتاندا هەندێ هەنگاو بهاوێژن، بەڵام لەبەر ئەوەی هێز دەکەوێتە ژێر کۆنترۆڵی مەلا مستەفا، هەموو شتێک سەراوبن دەبێت، ئیتر ئێوەش ناتوانن هیچ شتێک بکەن. کاتێک بەعسیەکان دەخوازن هەنگاوێک بهاوێژن، دان بە هەندێک مافدا بنێن دژی دەوەستێ بۆچی؟ پێویستە لەمانە تێبگەن.

**ئیبراهیم ئەحمەد:** هەندێک لە ڕۆشنبیرانی کورد لە ئێمەیان پرسی: ئێوە چی لە ئێراق دەخوازن؟ لە وەڵامدا گووتمان، دیموکراسی بۆ ئێراق و ئۆتۆنۆمی بۆ کوردان. لە وەڵامدا گووتیان: "ئەمە مەسەلەی ڕێپێوانێکی ئەوروپایە، داواکاریەکانتان هیچ پەیوەندییەکی بە شۆڕشەوە نییە".

**عەبدوڵڵا ئۆجالان:** ڕاستە، جگە لەمە درۆی گەورەتریش هەن. چەندین کەس لە ڕۆشنبیرانی کورد هاتنە لامان، بەتایبەتیش ئەو ڕۆشنبیرە کوردانەی ئێراق، بەڵام هیچ یەکێکیان لە درۆکانی بارزانی تێنەگەیشتوون. گەورەترین درۆی ئۆتۆنۆمییە. لەوانەیە بە زارەکی بڵێ دیموکراسی بۆ ئێراق و ئۆتۆنۆمی بۆ کوردان، بەڵام دیموکراسی لە هزر و مێشکیدا بوونی نییە و جێی نابێتەوە، تەنیا فێڵ و خەڵەتاندن هەیە، چونکە بە هیچ شێوەیەک پەیوەندی بە دیموکراسییەوە نییە. کەسایەتیەکەی، کەسایەتیەکی دیموکرات و دیموکراسیخواز نییە. ئۆتۆنۆمی لە لای ئەو لەپێناو دەسەڵات و سەرکەوتنی بنەماڵە و خێڵەکەیەتی، بە مانای ئۆتۆنۆمی خێڵەکەی دێت، بگرە لە هزری ئەودا جێگای ئۆتۆنۆمی بۆ خێڵ و عەشیرەتەکانی تریش نییە، بۆ عەشیرەتەکانی تر تەواو دیکتاتۆریکە.

کاتێک سەرۆکایەتی و هزرەکەی بەمجۆرە بێت چۆن ئەنجام بە دەست دێنن؟ وابزانم ئێستا بەرچاوتان ڕوونترە کە بۆچی ئەنجامی تەواوتان بە دەست نەهێناوە؟ چونکە مرۆڤی کورد خاوەن کەسایەتیەکی زۆر درۆزنە، بێگومان هەندێک سەرۆکایەتی هەن زۆر ساختە و غافڵ و نەفامن. ئەگەر لە بەرامبەریدا ڕێکار و تەگبیر وەرنەگریت، هیچ شتێک ناهێڵێ و هەر شتێک لە نێو دەبات. کەسایەتی کوردان کەوتووە و بچووک کراوەتەوە، دوژمن هیچی تێدا نەهێشتووە، گیانی لەبەر بڕیوە. ئێمە لەم ڕاستییە تێدەگەین.

ناچارین تێبگەین و تێکۆشانێکی دژواری لەبەرامبەردا پیادە بکەین. ئەم واقیعەی باسمان کرد خۆی لە کەسایەتی بارزانیدا دەبینێتەوە. مەسەلەکە PKK نییە. کاتێ مامۆستا سلاوی بۆ ناردین، بە گەرمی وەلاممان دایەوە و هەوالمان بۆ نارد و گووتمان؛ "پێویستە مەسەلەی بنەماڵەی بارزانی یان لە ڕێگەی سیاسییەوە یان لە ڕێگای شەڕەوە چارەسەر بکرێ، چونکە ئیتر سەبرمان نەما. چونکە بارزانیەتچێتی ڕەوتێکی کۆنەپەرستی کوردە، ئەم ڕەوتە بە واتای ڕزین و خراپ بوون دێت، بارزانی نوێنەری کەسایەتی گەندەڵە، نوێنەری بەدڕەوشتی و گەندەڵبوونە.
بێگومان ئەوەندە بچێتە لای ئێران و ئەم دەوڵەت و ئەو دەوڵەت دەکەوێتە نێو زەحمەتیەکی زۆرەوە، لێکدانەوە و حسابات لە سەر تۆوە دەکەن. بردنتان بۆ مەیدانی چوارچرا چ مانایەک دەگەیەنێت؟ کاتێ چوونە لای شای ئێران پێویستبوو نەگەڕێنەوە. کاتێک گەڕانەوە لای بەعسیش (لێرە دەردەکەوێ زۆر کورت بین بوون) مەترسیەکی مەزن لە ئارادایە. بەمجۆرە ناچار دەبن بکەونە نێو دۆخی ساڵی ١٩٦٦. لە پێناو پاراستنی ژیانی خۆتان لە مستەفا بارزانی ڕادەکەن، دواتر ناوتان دەبێتە "جاشەکانی ٦٦. بەلام هیچ کەسێک لەمە تێناگات، لە ڕاستیدا جاش کێیە؟ کێیە ڕێگای لە بەردەم ئەم دۆخە کردەوە؟ کابرا بە خۆی جاشایەتی دەکات، بەلام کەس لێی تێناگات. بەوانە دەڵێ جاش کە دژی جاشایەتی ئەو دەوەستنەوە. بەڵێ ئەمەیە درۆی مەزن،

بەڵام گەلیش بڕوای بەم درۆیە کردووە، وانییە؟ ئێمە دەتوانین ئەوە بسەلمێنین کە ئەوکات جاشایەتی بە جۆرێکیتر دەکرێت. کەسێکی تۆزێک هۆشیار و تێگەیشتوو دەستبەجێ لەمە تێدەگات، تەنانەت دەتوانێ ڕۆحەکەشی بناسێ.

هەروەها گەلێک هەڵە و کەموکورتی ئێوەش دەرکەوت. دەخوازن هەندێک تەنازولات لە ئێراق بەدەست بێنن، چونکە ئەگەر وانەبێت لە نێو دەچن، بەمە دەڵێ: "جاشایەتی". کەمێک ولاتپارێزی لە نێو ئەو پەیوەندییەدا هەیە کە تۆ لەگەڵ شای ئێران پەرەت پێدا، بەڵام پەیوەندییەکانی مەلا مستەفا بێ پرەنسیپە و جاشایەتی هەرە مەزنە. ئێوە کاتێ پەیوەندی لەگەڵ بەعسییەکان دەبەستن دەتانەوێ بۆ کوردان هەندێ مافیان لێ بسەنن، بەڵام پەیوەندی ئەو لە پێناو بەرژەوەندی شەخسی و خێڵەکییە. تا ئێستاش تێگەیشتنێک سەبارەت بەم دۆخە نییە. هەربۆیە دەخوازم بە قوڵی و فراوانی لەسەر ئەم خاڵانەدا بووەستن کە ئاماژەمان بۆ کرد. نەک لە پێناو ڕابردوو، بەڵکو لە پێناو ئێستا و ڕۆژگاری ئەمڕۆمان پێویستە تاوتوێی بکەین. چەندین کەسی کۆمۆنیست و ڕۆشنبیر و هونەرمەند و...هتد دێنە لامان، هیچ شتێک نازانن، تەنانەت نازانن سیاسەتیش پەیڕەو بکەن، تەنیا دەڵێن: "پارە، پارە و هیچی تر نا"، بەڵام بە لۆژیکی بازرگانان شۆڕش و شۆڕشگێڕیی ناکرێ. بەم

شێوەیە نابێ! نە دەتوانین پارەیان بدەینێ، نە ژن و نە پیاو، هیچ یەکێکیان بۆ ئێوە نامێنێتەوە.

**محەمەد ڕەسول هاوار:** حزبی شیوعی ئێراقی تا ڕادەیەک خاوەنی مێژووی بەرخودان بوو، هەروەها شیوعیەکان بنەمای کوردایەتییان نیشانی کوردان دا.

**عەبدوڵلا ئۆجالان:** چۆن؟ ئەوان کۆسپیان بۆ کوردان دروست کرد؟

**ئیبراهیم ئەحمەد:** ڕاستە فەرموون.

**عەبدوڵلا ئۆجالان:** ئێستاکە مۆسکۆ کەوتۆتە نێو چ ڕەوشێکەوە؟ لای ئێوە کەوتوونەتە چ حاڵێکەوە؟ لای ئێمە، لە تورکیا، کەوتوونەتە چی دۆخێکەوە؟ سەرمایەدارێکی مەزنی تورکیا کە ناوی جەم بۆینەرە جوڵانەوەی دیموکراسی نوێی دامەزراند، لە سەدا سەدی ئەندامانی مەکتەبی سیاسی پارتی کۆمۆنیستی تورکیا، ئێستا لای ئەو سیاسەت دەکەن. شتێکی وا لە کەسایەتی شیوعیەکانی ئێراقدا نابینم، ئەگەر بنەماڵەی مەلا مستەفا لایەکی مێشک و هزری کوردانیان پووکاندبێتەوە، ئەوا لاکەی تریش لە لایەن شیوعیەکانەوە پووکێنراوەتەوە. لەوانەیە هەندێ کەسایەتی لەناو شیوعیەکان دەرکەوتبن. بەڵام کەسانێکی زۆر لە قوتابخانەی بنەماڵەی مەلا مستەفا پێگەیشتوون کە بێ تەربیە و بێ ئەخلاقن و هیچ شتێک لە سیاسەت نازانن و لێی تێناگەن. لە لایەکی ترەوە شانبەشانی قوتابخانەی

بنەماڵەی مەلا مستەفا حزبی شیوعیش یاری بە مێشکی کوردان کرد. مامۆستا باش لە مەبەستم تێ دەگات.

خاڵێکی گرنگ لێرەدا هەیە، ئەویش ئەوەیە کاتێک کۆمۆنیستێک سەبارەت بە مەسەلەی کورد گفتوگۆ دەکات، نکۆڵی لە هەندێ شت دەکات؛ لای ئەو نەتەوایەتی و دیموکراسی بوونی نییە. لە ناو ئەم پارتانە، لەوانەیە حزبی شیوعی ئێراق ویستویەتی هەندێک شت بکات، لە لایەنی ئایدیۆلۆژی و سیاسییەوە خۆیان بە جوڵانەوەیەکی مارکسی دادەنا. بۆ نمونە، مەلا مستەفایان بۆلای خۆیان ڕادەکێشا، خواستیان چەمکی نەتەوایەتی و نەتەوەبوونی تێدا پێشبخەن. ئەمە شتێکی باش بوو، بەڵام نەیانتوانی کاریگەری بەسەر مەلا مستەفاوە بکەن، چونکە نەیانتوانی هزری عەشیرەتگەری بگۆڕن، لە ڕووی کردارییەوە پێیان گووت؛ "لە سەر بنەمای ئاغایەتی، عەشیرەتی و دیکتاتۆریەت بۆ خۆت بەردەوام بەو بەڕێوە برۆ". ئەگەر وەک ئەوەی لە بواری تیۆریی باسیان دەکرد لە بواری کرداریشدا جێبەجێیان کردبایە باش دەبوو، بەڵام ئەمە نەکرا و ڕووی نەدا.

دووەمیان ئەوەیە، "تۆ سیاسەتمەدار و ڕۆشنبیریی، ئەو هەموو شتێک لە تۆ فێردەبێ، بەڵام لە هەمانکاتدا خۆی وەک سەرۆکێک بەسەر خەڵکیدا دەسەپێنێ. هەر بۆیە من مەسەلەکە ڕوون دەکەمەوە، واتە ئەوە مەسەلەیەکی ژیانییە و پرسی هەموو کوردانە. مستەفا بارزانی کەسایەتیەکی بێ

جددییەت و فێڵبازە، دوژمنی گەلی کوردە، هەروەها لە سەفقە و بازرگانی کردندا کارامە و بە توانایە. دوژمن باش دەزانێ چی بەرامبەر کوردان پەیڕەو بکات، باش دەزانێ لەگەڵ کێ و چۆن پەیوەندی ببەستێ. بۆچی تەواوی دوژمنانی کورد پەیوەندیی لەگەڵ مستەفا بارزانی و بنەماڵەکەی دەبەستن؟ چونکە زۆر بە ڕێکوپێکی ڕۆڵی بەکرێگیراوی و خیانەت جێبەجێ دەکات و ئیرادەی خۆی تەسلیم بە دەوڵەت و هێزەکانی دیکە دەکات. یەکێک کە لایەنگری ئەم هەموو دوژمنانەی گەلی کورد بکات، هەموو شتێک دەکات. لەسەر ئەم بنەمایەش سەفقە و بازرگانی دەکات. مرۆڤ سەیر دەکات شتێکی خراپ نەماوە نەیکردبێت. وەک دەردەکەوێ لە کۆنەوە لە ڕووی بەکرێگیراویی و بازرگانی کردن بە پرسی کورد وەستا و کارامەن. بۆ نموونە، ئەو بازرگانی و نۆکەرایەتییەی کە دەیکات، دەیخاتە ئەستۆی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد.

چۆن دەبێ پیاوێکی بەم جۆرە خۆی بکات بە سەرۆکی کوردان؟ ئەمە ئیزرائیل خۆیەتی، زۆربەی ئەو خراپەکاریانەی لە کوردستان ڕوویانداوە، لە ژێر سەری ئەو دەرکەوتووە. لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا دیسان ئەم حەقیقەتەیان ئاشکرا بووە. لە ڕۆژی ئەمڕۆماندا زۆرترین درۆ و قسەی هەڵبەستراو سەبارەت بە ئێمە دەکات. لەوانەیە ئێوە نەتان بیستووە، بەڵام لە مام جەلال بپرسن کە ئەو درۆ و دەلەسە و قسە هەڵبەستراوانە چین کە

سەبارەت بە ئاپۆ دەگوترێ، ئەو بۆتان باس دەکات. شتێکی دیار و بەرچاوە کە لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆنەکانی سەر بە بنەماڵەی مەلا مستەفا ڕۆژانە چەندین درۆ دەکرێت. ئێستا هەندێ کوردی دڵسۆز هەن و دەخوازن هەندێ کاری باش بکەن، بەڵام ڕێگایان پێ نادات و دەرفەت بە لاوانیش نادات. بەڵێ نایەوێ ڕێ بە هیچ کەسێک بدات.

**محەمەد ڕەسوڵ هاوار:** هۆکاری ئەمە چییە؟ کوردستان دەفرۆشێ و کەس ناخوازێ ڕێگری لێ بکات.

**عەبدوڵلا ئۆجالان:** بەڵێ، بێگومان ئەو پارەیەی وەریشی دەگرێ تەنیا بۆ خۆی و بنەماڵەکەیەتی. لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا دەڵێن: "ئێمە ئازادین، حکومەتی خۆمان دادەمەزرێنین". هەواڵی بۆ ناردم، دەڵێ با بێتە لامان. بێگومان ئەگەر بچین پەرێشانمان دەکات و لە نێومان دەبات. ئەگەر یەکێکی وەکو مەسعود بارزانی بتوانێ حکومەت دابمەزرێنێ، تۆ دەتوانی کاری زۆر مەزنتر بکەیت. زیاتر لەسەر ئەم بابەتە ڕادەوەستین، لەو بڕوایە دام کە سوودبەخش دەبێ. بیر و بۆچوونی ئێوەش وەردەگرین، دەتوانن هاریکاریمان بکەن. هەروەها بیر و بۆچوونەکانی مامۆستاش وەردەگرین. ئیتر نامەنەوێ درۆ و خەڵەتاندن زاڵ و بەردەوام بێت، بەڵکو پێویستە درۆ و ساختەکاریی کۆتایی پێبێت و ڕاستییەکان دەرکەونە ڕوو. ئیتر با مرۆڤی کورد، لاوان و ڕۆشنبیرانی کورد ڕاستیەکان ببینن، با ڕووناکی ببینن تا کەس نەتوانێ ڕێگایان لێ بشێوێنێ و

چەواشەیان بکات. چونکە درۆ و ساختەکاریی مەزن لە ئارادایە و پێویستە لە ناویان بەرین. هەندێ ڕاستی هەن پێویستە هەر کەسێک ببینێ و بیزانێ.

مامۆستا بۆ ئەوەی بابەتەکە کۆبکەینەوە سەر یەک، مرۆڤ دەتوانێ چی سەبارەت بە ماوەی نێوان سالانی ١٩٧٠-١٩٧٥ بلێ؟ لەو قۆناخەدا ڕۆلی مستەفا بارزانی چی بوو؟ ئێوە ویستتان چی بکەن؟ ڕێککەوتنی ١١ی ئادار هەبوو، بەلام لە سالی ١٩٧٥ ئیفلاسی کرد و مەلا مستەفا ڕای کرد و ڕۆیشت. ئەمە وەک ڕاکردنێکی مەزن دەبینم. ئێوەش هیچ شتێکتان نەکرد. یەکێتی دامەزرێنرا، بەلام زۆر لاواز بوو، زۆر شت لە دەستچوو، هۆکاری ئەوە چی بوو؟ بۆچی ئەم دەرەنجامە هاتە ئاراوە؟ بۆ شیکردنەوەی ڕەوشی کوردستان هەلسەنگاندنی ماوەی نێوان سالانی ١٩٧٠-١٩٧٥ زۆر گرنگە. لەم مێژووەدا پەکەکەش لەدایک بوو. ئەو خالە سەرەکییەی قۆناخی ٧٠-٧٥ کامەیە کە پێویستە لە تەواوی کوردستان بە بنەما بگیرێ؟ کام قۆناخ کۆتایی هات؟ کام قۆناخ دەستی پێکرد؟

**ئیبراهیم ئەحمەد:** کاتێ گەیشتینە سالی ١٩٧٥ ڕەوشی پارتیمان شیکردەوە. لە سالی ١٩٧٠ من و هەڤالێکمان لە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی چووینە بارەگاکەی مەلا مستەفا، لەوێدا کۆبوونەوەیەکمان لەگەل سازکرد. لە سەرەتا مەلا مستەفا بە تەنیا لە گەلمان لە کۆبوونەوەدا بوو، دواتر تەواوی کۆمیتەی ناوەندی سەر بە مەلا

مستەفاش جێگای خۆیان لە کۆبوونەوەکەدا گرت. دەستپێک هەندێ مەسەلە و گیروگرفت لە کۆبوونەوەکەدا دەرکەوت. هەندێ دژە هەڵوێستی ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی دەرکەوت، مەلا مستەفا پێی گووتن: "ئەمە خەتای ئێوەیە، پارە و هێزم پێدان تا بیان کوژن و لە ناویان بەرن، بەڵام ئێوە نەتان کوشتن، ئێستاش من پەسەندیان دەکەم. هەروەها هەندێ لە دەوڵەتە بە هێزەکانی ناوچەکە دەخوازن لەگەڵیاندا ڕێککەوین، ئێتر ناتوانم پەسەندیان نەکەم".

ئەو شتانەی مەلا مستەفا دەیگووت ڕاست نەبوو، شتێکی بەم جۆرە لە ئارادا نەبوو. چونکە هەندێ کەس لەوان لایەنگری ڕێککەوتن بوون، دەیان گووت: "پێویستە لەگەڵ مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد و لایەنگرەکانی ڕێککەوین". بەڵام مستەفا بارزانی زیاتر و جدیتر گوێڕایەڵی بۆ قسەکانی ئەو کەسانە دەگرت کە پێشتر لە ئێراق سیخوڕێتیان بۆ ئینگلیزەکان کردبوو و دواتر ڕایان کردبوو. واتە هێندە گوێڕایەڵی کەسایەتییە وڵاتپارێزەکانی نەدەکرد. هیچ خەیاڵێکی بەم جۆرەمان نەبوو کە یان بچینە ئێران و ببینە جاش، یان لەلای مەلا مستەفا بمێنینەوە. بەیاننامەی ١١ی ئادارمان بە باش دەبینی. بە مەلا مستەفامان گووت: "ئەوەی تۆ دەیڵێی ئێمە پەسەندی دەکەین". لەم چوار چێوەیەشدا ڕێککەوتنمان پەسەند کرد؛ ئەوەم پەسەند کرد کە ئێتر بە تەواوی لای مەلا مستەفا بمێنم و لە ناوچەکە دەرنەکەوم. هەندێ کەسیتریشم لەگەڵدابوون، مەلا مستەفا ئەو

ئەندامانەی کۆمیتەی ناوەندی پەسەند کردن کە لەگەڵ من بوون، تاڵەبانیش بە بیانووی تەواوکردنی خوێندن چووە ئەوروپا.

لەم قۆناخەدا حکومەتی ئێراقیش پشتگیریی لە مەلا مستەفا دەکرد. بارزانی دەسەڵاتی خۆی لەو ناوچانەدا بەهێزکرد کە لە ژێر کۆنترۆڵیدا بوون، تەنانەت حکومەتی ئێراق چاوپۆشی کرد تا مەلا مستەفا دەسەڵاتی خۆی بەسەر شاری سلێمانیشدا بەهێز بکات کە تا ئەو کاتە لە ژێر کۆنترۆڵیدا نەبوو. ئەویش وەک وەزیرێک جێگای خۆی لە ناو حکومەتی ئێراقدا گرت. ئەگەر بارزانی نەبووایە، ئەوا لە دەرەنجامی ئەو ڕێککەوتنەی ئیمزاکرابوو حکومەتی ئێراق لە ٥٠٪ ی داواکاریەکانمانی جێبەجێ دەکرد، چونکە حکومەتی ئێراق بە ڕاستگۆیی دەجوڵایەوە. ئەگەر مەلا مستەفا مرۆڤێکی ڕاستگۆ و دڵسۆز بووایە و نەکەوتبایە ناو خیانەتی نیشتیمانی، ئەوکاتە داواکاریەکانمان بەدیدەهات. **ئەوەی بووە کۆسپ حکومەتی ئێراق نەبوو، بەڵکو خودی مەلا مستەفا بوو.** لە ڕێککەوتنی١١ی ئادار بۆ یەکەم جار بوو شۆڕشی کوردستان (جوڵانەوەی کوردی) دانی پیادەنرا. تەنیا حکومەتی ئێراق نا، بەڵکو گەلێک دەوڵەتی بیانی دانیان بە شۆڕشی کوردستاندا نا و هاتن دیدار و چاوپێکەوتنیان ئەنجامدا. بۆ نمونە، نوێنەرایەتی ئەمریکا، ئیسرائیل و ئێران و هەندێ دەوڵەتی تریش هەبوون. ئامانجی ئێراق لەو ڕێککەوتنە ئەوەبوو؛ ئەو پەیوەندییەی

ئەمریکا، ئیسرائیل و ئێران ببڕێ کە لەگەڵ کوردەکانی ئێراق هەیانبوو. بەڵام مەلا مستەفا ئەم خاڵە گرنگەی ڕەچاو نەکرد و پێشێلی کرد. بە گوێرەی ڕۆحی ڕێککەوتنەکە ڕەفتاری نەکرد.

لەم قۆناخەدا میر کامەران بەدرخان هاتە ئێراق و حکومەتی ئێراقیش پەسەندی کرد و وەک ڕێبەرێکی کوردان پێشوازی لێ کرد. دواتر بۆ بینینی مەلا مستەفا هاتە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ئەو. دوایی لە ڕێی ئوتۆمبێلەوە دەربازی ئێران بوو، لەوێشەوە گەڕابوویەوە پاریس. لێرەدا بۆ جاری یەکەم مەلا مستەفا ڕێککەوتنی ١١ی ئاداری پێشێل کرد و پەیوەندی لەگەڵ ئێران بەست. چونکە پەیوەندی نەبەستن لەگەڵ دەرەوە مەرجێکی ڕێککەوتنەکە بوو. پەیوەندییەکانی مەلا مستەفا لەگەڵ ئێران زۆر لە جاران بەهێزتر بوو، بەتایبەتیش پەیوەندییە ئابووریی و سەربازیی و سیاسییەکان زۆر بەهێزبوو.

ئیتر باشووری کوردستان بوو بە مەیدانی قاچاخچییەکان. پەیوەندییەکانی مەلا مستەفا لەگەڵ ئێران زۆر لەو پەیوەندییانەی لە پێشتر و بەهێزتر بوو کە لەگەڵ ئێراق هەیبوون. سەرەتا حکومەتی ئێراق چاوپۆشی لەو دۆخە کرد، بەڵام دواتر بینی کە شتێکە پەسەند ناکرێت. بەتایبەتیش هەندێ کەس لە ناو حزبی بەعسی دەسەڵاتدار هەبوون دژی ئەم ڕەوشە بوون، ئیتر دەنگی دوژمنانی کورد بەرزتر دەبۆوە. چارەسەرییان لەوەدا بینیەوە لەگەڵ

ئێران ڕێککەوون. ئەو کاتە لە هەندێ شوێن ناو بە ناو پێکدادان لە نێوان هێزەکانی حکومەتی ئێراق و هێزەکانی مەلا مستەفا ڕوویدەدا. ئیتر حکومەتی ئێراق مەلا مستەفای وەکو مەترسیەکی مەزن دەبینی و پیلانی لێدانی ئەوی دانا. هەربۆیە پەیوەندی لە نێوان مستەفا بارزانی و حکومەتی ئێراق نەما. دوای ئەوەی ڕێککەوتنەکە لەگەڵ حکومەتی ئێراق تێکچوو، شاندێکی مەزن لە ئێران هات، ئەوانەی هاتن کارمەندانی هەواڵگریی و سەربازیی و دارایی بوون. لەم ماوەیەدا پەیوەندی نێوان ئێراق و یەکێتی سۆڤیەت باش بوو، تەنانەت پرۆتۆکۆڵیان لە نێوان خۆیاندا ئیمزا کردبوو. هەربۆیە حکومەتی ئێراق شیوعیەکانیشی بۆلای خۆی ڕاکێشاو لە ناو حکومەتدا جێگای پێدان. هاوپەیمانێتییان بەست، داوایان لە پارتی کرد جێگای خۆی لە ناو ئەو بەرەیەدا بگرێ، بەڵام پەسەندی نەکرد و ڕەتی کردەوە. پارتی لە پێناو ڕێککەوتن و لێکگەیشتن داوای ناوبژیوانی کرد. بەتایبەتیش ئیتر بەشێوەیەکی ئاشکرا دەبینرا کە حکومەت سەبارەت بە مەسەلەی کەرکوک ڕێککەوتنی ١١ی ئادار پێشێل دەکات. بەڵام دیسان هۆکاری سەرەکی خیانەت مەلا مستەفا بوو. ئێمە لەلای خۆمانەوە (وەک پارتەکەی ئیبراهیم ئەحمەد) لەگەڵ هیچ لایەنێکیان ڕێککەوتنمان ئەنجام نەدا.

لەم ماوەیەدا شاندێکی سۆڤیێتی هاتن، چوونە ماڵی مەلا مستەفا و سەردانیان کرد، سەرۆکی شاندی سۆڤیێتی

"گریماکۆڤ" داوای له مەلا مستەفا کرد نوێنەرێکی خۆی بنێرێته مۆسکۆ. سۆز و پەیمانی ئەوەیاندا که ڕێککەوتن له نێوان کوردان و حکومەتی ئێراق بەدی دێت، هەروەها پەیمانی ئەوەیدا که سۆڤیەت داخوازییەکانی کوردان به سەرکەوتن بگەیەنێت. تا ئەو کاتەش ئەو سیاسەتانەی مەلا مستەفا شاراوە بوون که لایەنگریی ئەمریکا بوون. مەلا مستەفا دەیویست یارمەتی له ئەمریکا و له سۆڤیەتیش وەربگرێت. لەو قۆناخەدا پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ سۆڤیەت بڕی و وەک موریدێک خۆی به ئەمریکاوە بەستەوە. ئەگەر گوێڕایەڵی قسه و ئامۆژگارییەکانی سۆڤیەتی بکردایە، ئەوا ئەو مافانەی دەخستە ژێر گەرەنتییەوە که له ڕێککەوتنی ئادار بۆ کوردان دانی پیانرابوو.

ئامانجی ئێران و ئەمریکا ئەوە بوو حکومەتی ئێراق لاواز بکەن. یەکەم، هۆکار ئەوە بوو ئێراق دەوڵەتێکی عەرەبی بەهێزی ناوچەکه بوو، ئەمەش پێچەوانەی بەرژەوەندییەکانیان بوو. دووەمیشیان، لەبەر ئەوەی هاوپەیمانی سۆڤیەت بوو. هەر بۆیەش جگه له فڕۆکەی جەنگی هەموو جۆره چەکێکیان به مەلا مستەفا دابوو. دیسان بۆ جارێکیتر شەڕ و پێکدادانی توند له نێوان حکومەتی ئێراق و مەلا مستەفا ڕوویدا. کاتێ ئێراق کەوتە نێو زەحمەتییەوە له ڕێی تورکیاوە پەیوەندی لەگەڵ ئەمریکا

و ئێران بەست. بەم جۆرە چاوپێکەوتن و دیدارەکان بەردەوام بوون تا ڕێککەوتنی جەزائیر سەریگرت.
لە ٦ ی ئاداری ساڵی ١٩٧٥ حکومەتی ئێران سەبارەت بە پشتگیریی نەکردنی کوردان تەنازولی زۆر گەورەی لە حکومەتی ئێراق سەند، شەتولعەرەب کە پێشتر جێگای ململانێ و ناکۆکی بوو درا بە ئێران. مەلا مستەفا بەردەوام لە نێو گومانی ئەوەدا دەژیا ئەگەر بێتو شەڕێک لە نێوان ئەو و حکومەتی ئێراق دەربکەوێت، لایەنی حکومەتی ئێراق بگرین.
لەم ماوەیەدا من و فوئاد مەعسوم لە ئێران بووین، بەڵام دەستبەجێ گەڕاینەوە کوردستان. بەر لە نوێنەرەکەی مەلا مستەفا دەرکەوتین. نوێنەرەکەی ئەو ناوی "سدقی موتنی" بوو. کاتێ گەیشتینە شارۆچکەی "خانێ" ی نزیکی سنور ڕوو بە ڕووی خۆپیشاندان و نارەزایی گەل هاتین. لە تەواوی کوردستان خۆپیشاندان دژ بەو بەیاننامەیە دەکرا کە کۆمیتەی ناوەندی مەلا مستەفا بڵاوی کردبوویەوە. لە بەیاننامەکەدا نوسرابوو؛ "یان ئەوەتە دەچن خۆتان تەسلیمی حکومەتی ئێراق دەکەنەوە، یان چەکەکانتان تەسلیم بە ئێران دەکەن و وەک پەنابەرێک لە ئێران دەژین". گەلی کوردیش دەیگووت؛ "جگە لەم دوو ڕێگایە، ڕێگایەکیتر هەیە، ئەویش بەرخودان و تێکۆشانە؛ هەرگیز تەسلیم نابین". هۆکاری گەڕانەوەی من بە ئامانجی ئەوەبوو هەندێ لە هەڤاڵە نیشتیمان پەروەرەکان ببینم تا دژی ڕێککەوتنی ئێراق-

ئێران بووەستین و بەڵکو کارێک بکەین. بە لانی کەم بیرم لەوە دەکردەوە لە ڕێگای ڕێککەوتنی جەزائیریش بێ هەندێ شت بۆ کوردان بسەنین. دەمانگوت؛ "ئەگەر شۆڕشیش نەکرێت، با هەندێک ماف بە دەست بێنین". بە گوێرەی ڕێککەوتنەکە دەبووایە تا ۱۳ی ئادار تەواوی چەکەکان تەسلیم بکرێتەوە.

لەم ماوەیەدا لەسەر بانگێشتی شای ئێران و بە ئامانجی کۆبوونەوە مەلا مستەفا لە تاران بوو. ئەو کەسانەی لە کۆبوونەوەکە ئامادە بوون بەو جۆرە دەیگێڕنەوە: دەڵێن شای ئێران بە مەلا مستەفای گووت؛ "پەیوەندیمان لەگەڵ ئێراق بەست، چیتر لەمەو بەولا من ناتوانم پشتگیریی لە جولانەوەی کورد بکەم"، هەروەها داوای لە مەلا مستەفا کرد بلاوە بە جولانەوەکەی بکات. وەلامی مەلا مستەفاش بۆ شا بەم جۆرە بووە: "ئەوەی شا بۆ بەرژەوەندی ئێرانی باش دەبینێت، لەو بڕوایەدام بەرژەوەندی ئێمەشی تێدایە و پەسەندی دەکەم". کاتێک مەلا مستەفا لای شا دەردەکەوێ، سەرۆکی دەزگای ساواک لێی نزیک دەبێتەوە و پێی دەڵێ: "بۆچی بەم شێوەیە پەلە دەکەیت، دەبووایە وا بە خێرایی بڕیار نەدەیت. دەبووایە بگەڕێیتەوە کوردستان برادەران و هەڤالانت ببینی و دواتر بڕیار بدەیت". بێگومان سەرۆکی ساواک لەبەر ئەوە وای بە مەلا مستەفا نەگووتووە کە کوردی خۆشدەوێت، بەڵکو گومانی لەوە دەکرد ئێراق بڕیارەکان جێبەجێ نەکات، بۆیە دەیانخواست کارتی

'وەرەقەی' مەلا مستەفا تا جێبەجێ کردنی بڕیارەکان لە لایەن ئێراقەوە بەکار بێنن. بەڵام ئەوەی دیاربوو مەلا مستەفا زۆر لەوان بە پەلەتر بوو.
چاومان بەهەندێ کەسایەتی کەوت، زۆرینەی گەلی کورد لەم ڕەوشەدا لایەنگری درێژە پێدانی خەبات و تێکۆشان بوون. جوڵانەوەکەشمان جوڵانەوەیەکی وا بچووک و ئاسایی نەبوو. بۆ گەیشتن بە سەرکەوتن مرۆڤی جەنگاوەرمان زۆر بوو، هەموو جۆرە تەکنیکێکمان هەبوو، هەروەها پشتگیرییەکی زۆری خەڵکمان لە پشت بوو، بە هەزاران چەک و پێشمەرگەمان هەبوو، جگە لەو شتوومەکانەی مەلا مستەفا شاردبوونییەوە (لە ناویشیاندا بیست ملیۆن دۆلار) هەر شتێکمان هەبوو. حکومەتی ئێران تا ۱۹ی ئادار تۆپەکانی خۆی لە کوردستان جێهێشتبوو، تا گەڕانەوەی مەلا مستەفا، شەڕ تاوەکو ۱۳ی مانگ بەردەوام بوو. شەوێکیان دەمویست مەلا مستەفا ببینم تا گفتوگۆ سەبارەت بە دۆخەکە بکەین. بینیم یەکێک لە دارودەستەکانی هات، لێی پرسیم: 'چی دەخوازی'. منیش پێم گووت؛ 'دەخوازم مەلا مستەفا ببینم'، پێی گووتم؛ 'هەموو شتێک کۆتایی پێهات'. دواتر بەرپرسیارێکی ساواک و دیبلۆماتێکی ئەمریکیم بینی، پێم گووتن؛ 'دەرکەوتن لەو ڕێککەوتنەی نێوان ئێراق-ئێران بەستراوە ڕوو نادات، جوڵانەوەی ڕزگاری نەتەوەیی کورد کارێکی بەم جۆرە

ناکات". دوای ئەم ئاخافتنە ڕۆیشتم و کۆمیتەی ناوەندی مەلا مستەفام بینی.

تاکە کەسێک کە تا دوایی پشتگیریی لەو ڕێککەوتنە دەکرد سامی عەبدولڕەحمان بوو، پێی گووتم: "ئێمە تەنیا بە پشتگیریی کردنی ڕێککەوتنی نێوان ئێراق-ئێران سنووردار نابین، بەڵکو دژی ئەو کەسانەش شەڕ دەکەین کە دەیانەوێ ئەم ڕێککەوتنە تێک بدەن". دواتر ساڵح یوسف و دارا کوفیم بینی، ئەوانە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی مەلا مستەفا بوون، لە یەکەم ڕۆژی ڕێککەوتن چوون خۆیان تەسلیمی ڕژێمی ئێراق کرد. ئەندامەکانی دیکەی کۆمیتەی ناوەندیش ئامادەکاری ئەوەیان دەکرد بچن خۆیان تەسلیم بکەنەوە، ئیتر نە پارتی و نە کۆمیتەی ناوەندی نەمابوون، هەموو شتێک بە دەستی مەلا مستەفا و مەسعودی کوڕە بچووکەکەی بوو. من ئەو کاتە لە تاران بووم. حکومەتی ئێراق دەیویست من بگەڕێمەوە ئێراق، کاتێ نەیتوانی من ڕازی بکات، ئەوکاتە بە ئێرانی گووت: "ئەو مرۆڤە کێشە و گیروگرفت دروست دەکات، دەیەوێ دەست بە جوڵانەوەیەکی نوێ بکات، پێویستە لە ئێران نەمێنێتەوە". ئەو کاتە کاربەدەستانی ئێرانی پێیان گووتم: "یان دەچی لە سنووری ئەفغانستان بۆخۆت نیشتەجێ دەبیت، یان ئەوەتە دەبێت لە خاکی ئێران دەربچی". منیش ئێرانم بەجێهێشت و چوومە ئینگلتەرا.

**عەبدوڵلا ئۆجالان:** ئەی دەرکەوتنی عەلی عەسکەری و هەڤالانی چۆن بوو؟ بۆچی لەناوبران؟

**محەمەد ڕەسوڵ هاوار:** هەر لە دوای ڕێککەوتنی جەزائیر هەندێ لە لاوە کوردە نیشتیمان پەروەرەکان ئەم ڕێککەوتنەیان پەسەند نەکرد و بەرەو چیاکان ڕۆیشتن، یەکێک لەمانەش شەهید عەلی عەسکەری بوو. ئەو و هەڤالانی مەرجە داسەپاوەکانیان پەسەند نەکرد و بەرخودانیان کرد، تاوەکو لەلایەن دوژمنەکانیانەوە لەناوبران. دوای شەهیدبوونی عەلی عەسکەری و هەڤالانی، ڕەسوڵ مامەند دەربازی کوردستان بوو، خەڵکی لەدەوروبەری خۆی کۆکردەوە و هێزی پێشمەرگەی پێکهێنا، حکومەتی ئێراق دەیویست بە پارە بیکڕێ. تەنانەت خواستیان سەد هەزار دیناری پێبدەن. ئەوکاتە هەندێ ڕێکخراوی تریش (لەوانەش کۆمەڵە) هاتنە لای یەکتر و یەکێتی نیشتیمانی کوردستانیان پێکهێنا. جەختیان لەسەر ئەوە دەکردەوە کە خەبات و تێکۆشان لە پێناو چارەسەرکردنی پرسی کورد دەکەن. هەروەها هەندێ لە لاوانی شارەکانیش هاتن بەشداری ریزەکانی ئەو ڕێکخراوە بوون. دوای ئەوە تەواوی گەل بڕیاری درێژە پێدانی تێکۆشانی دا. ئیتر جولانەوەی کورد بەگیانێکی نوێ و بەشێوەیەکی بەهێز کەوتە ژێر کۆنترۆلی گەنجە نیشتیمانپەروەرەکانەوە.

دوای شەڕی کەنداو (شەڕی کوێت) گەلی کورد ڕاپەڕی و هێزەکانی سوپای ئێراقی بەدەرنا. دوای هێرشە دڕندانەکەی ڕژێم بۆ سەر کوردستان کۆچبەرێەکی مەزن هاتە ئاراوە و خەڵک شارەکانی بەجێهێشت و بەرەو چیاکان ڕۆیشتن. ئەوەش یەکێک بوو لە دەرەنجامی ئەو سیاسەتەی کە دەوڵەتانی هاوپەیمانان بەسەر ئێراقدا پەیڕەویان کرد. لە ئەنجامی وەستاندنی ئێراق لە لایەن دەوڵەتە هاوپەیمانەکان، کوردەکانیش گەڕانەوە ئەو شوێنانەی کە هێزەکانی سوپای ئێراق چۆڵیان کرد، بەمجۆرە حکومەتی فیدراڵی خۆیان دامەزراند.

هەروەکو چۆن ڕێبەری جوڵانەوەی کورد، مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد ئاماژەی پێکرد، کەسە ڕۆشنبیر و گەنجە وڵاتپارێزەکان، پێویستە ئەم ڕاستیە باش ببینن ئاخۆ؛ بۆچی سەرهەڵدانەکانی ڕابردوو بە سەرکەوتن نەگەیشتن، هۆکاری چی بوو، بۆچی شکستیان هێنا؟ هەروەکو لەم نمونانەشدا دەبینین پێویستە باش تێبگەین، دەتوانم هەندێ نمونەی ئەم سەرهەڵدانانە بێنمەوە. بۆ نمونە، سەرهەڵدانی بەدرخان بەگ کە گەورەترین سەرهەڵدانە، سەرەڕای ئەوەی لە باکوور تەقیەوە، بەڵام بەرەو خۆرهەڵاتی کوردستان ئاڕاستەیان گرت، دەیانگووت؛ "ئێران لاوازە، سەرەتا لە ئێران شۆڕش ئەنجام دەدەین، دواتر دەگەڕێینەوە باکووری کوردستان و درێژەی پێدەدەین".

شێخ عوبەیدوڵڵاش کەوتە نێو هەمان هەڵە و لە خۆرهەڵات دەستی بە سەرهەڵدان کرد.

لەم قۆناخەدا ڕاستینەی مێژوویی ئەوەی دەسەلماند کە دەوڵەتی ئێران هەم لەلایەن ڕووسیای قەیسەری و هەم لەلایەن خۆرئاواوە گرنگیەکی خۆی هەبوو. هەروەها یەکێتی خاکی ئێران بۆ کەنداویش زۆر گرنگ بوو. هەڵەی ڕێبەرە کوردەکان ئەوە بوو چوون لەوێ دەستیان بە سەرهەڵدان کرد.

شۆڕشگێرە کوردەکان کاتێ دەستیان بە هەڵگیرساندنی شۆڕش کرد پێویست بوو باش لەم ڕاستیە تێبگەن؛ ئەوکاتە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لاواز بوو، پیاوێکی نەخۆش بوو. هەربۆیە لە جیاتی بەرژەوەندییە خێڵەکی و ناوچەییەکان، دەبووایە لەسەر بنەمای گەوهەرێکی نەتەوەیی لە کوردستان دەستیان بە سەرهەڵدان کردبووایە.

لاوازیەکی تری جوڵانەوە کوردییە کلاسیکییەکان، پرسی سەرۆکایەتی بوو. هەر کاتێک ڕێبەر لە ناوچوو، سەرهەڵدانیش دووچاری شکست دێت. خاڵێکی دیکەی گرنگ گەلی کورد تا ئێستاش دۆست و دوژمنی خۆی ناناسێ. نازانێ بەچ شێوەیەک دۆست بۆخۆی بخوڵقێنێ و پەیدای بکات. هەروەها نەیدەزانی بە چ شێوەیەک گەل ئاراستە بکات و بیخاتە نێو جموجۆڵەوە، ئەو سەرهەڵدانانەی باسمان کرد زیاتر سەرهەڵدانی ناوچەیی و سنوردارن. شێخ سەعید و قازی محەمەدیش سەرکەوتنیان بەدەست نەهێنا، چونکە لەجیاتی سەرهەڵدانێکی نەتەوەیی

بەرفراوان، سەرهەڵدانی ناوچەیی و سنوورداریان بەرپاکرد. لە مێژووی یاخیبوون و سەرهەڵدانەکانی کورددا گەلێک وانە و ئەزموونی مێژوویی هەن، پێویستە ئەمانە باش بزانین و فێربین، پێویستە هیچ پارتێک ئەمانە نەکاتە جێگای غرور و کێشەی کەسایەتی. هەروەها پێویستە کێشەکانی ڕۆژگاری ئەمڕۆشمان چارەسەر بکەن.

**عەبدوڵلا ئۆجالان:** بەڵێ، کەسایەتی مەلا مستەفا خاوەن چ جۆرە تایبەتمەندییەک بوو؟ چۆن ڕۆحێک بوو و تا چ ڕادەیەک دەرکی پێکراوە؟

**ئیبراهیم ئەحمەد:** مەلا مستەفا وەکو ئاغای عەشیرەت وابوو. وەک تەواوی ئاغا و سەرۆک عەشیرەتەکانی دیکەی کوردستان لە سایەی ئەم تایبەتمەندیانە توانی درێژە بە تەمەنی خۆی بدات. لای ئەو تەنیا مەرجێک هەبوو کە هێندە خۆت تێکەڵی سیاسەت نەکەیت، لە سیاسەت زیاتر لە خزمەتی بنەماڵەکەیدا بیت. ئەوەی لەگەڵیدا بووایە دەبوو هەموو شتێک پەسەند بکات و نەزان بێ. بەردەوام وەک سەرۆک عەشیرەتیک دەیویست ملکەچی بۆ بکرێت و خزمەتی بکرێت. مەلا مستەفا تەواو پێچەوانەی شێخ مەحمود بوو. شێخ مەحمود بەردەوام لە پێشەوەبوو، لە شەڕ و چالاکیدا بەردەوام جێگای خۆی لەنێو گرووپی هێرشدا دەگرت، سەربازەکانی بیریان لەوە دەکردەوە چۆن شێخ مەحمود بپارێزن و نەهێڵن هێرش بباتە سەر سەربازەکانی دوژمن. بەڵام مەلا مستەفا زۆر دووری مەسەلە سەربازیەکان بوو. زۆر بەباشی خۆی دەپاراست، بە ڕۆژ لە شوێنێک و بە شەو لە شوێنێکی تربوو.

لێرەدا دەمەوێت ئاماژە بە مەسەلەیەک بکەم، هەندێ بێتەلمان بە دەست کەوت (دەسکەوتی شەڕ بوو، هی سوپای ئێراق بوو) بە ئامانجی ئاسانکردن و خێراکردنی پەیوەندی، هەندێ لەم بێتەلانەم بۆ مەلا مستەفا نارد. سەبارەت بەم مەسەلەیە بەم جۆرە قسەی بۆ دەوروبەرەکەی کردبوو: "دەبینن ئیبراهیم ئەحمەد تا چ ڕادەیەک دوژمنایەتیمان دەکات، هۆی ناردنی ئەم دەزگایانە ئەوەیە، کاتێ من بە بێتەل قسە بکەم، فڕۆکەکانی ئێراق شوێنم دیاری بکەن و بەمجۆرە لە ناوم ببەن". هەر بۆیە شوێنی بێتەلەکەی شەش سەعات لە خۆی بە دوور دامەزراندبوو، ئەو هەواڵانەی بۆی ڕەوانە دەکرا، دوای ڕۆژێک پێی دەگەیشت.

**عەبدوللا ئۆجالان:** بۆچوونی ئایدیۆلۆژیی ئەو چیبوو؟ نەتەوەیی بوو؟ خێڵەکی بوو؟ ئایینی بوو؟ ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی ژمارەیان چەند بوو؟

**ئیبراهیم ئەحمەد:** بارزانییەکان خۆیان عەشیرەت نەبوون؛ بەڵکو لقێک یان تیرەیەکی سەر بە عەشیرەتی زێباری بوون، بەڵام بارزانچێتی زیاتر لە مەزهەبێکی ئایینی دەچوو. سەر بە تەریقەتی نەقشبەندی بوون و پشتیان بە مەولانا خالید دەبەست. سەبارەت بە مەسەلە ئاینییەکان بەها و ڕێزێکی زۆر بە شێخ ئەحمەد دەدرا، ئەمە لەبەر ئەوە نەبوو کە برا گەورەی مەلا مستەفا بوو، بەڵکو شێخ ئەحمەد وەک خودانی بارزان و سێبەری خودا لە ناوچەکە دەناسرا.

**عەبدوللا ئۆجالان:** باشە تۆ بڵێی ئەمانە بنەماڵەیەکی باکووری کوردستان نەبن؟ هاتبن لەم ناوچەیە نیشتەجێ

بووبن و تێکەڵ بەم عەشیرەتە بووبن، واتە ناشێ ئەندامانی هەمان ڕێبازبن و هاتبن لەم ناوچەیە نیشتەجێ بووبن. بە گوێرەی مەزەندەی من دۆخی بنەماڵەی مەلا مستەفا بەم جۆرەیە. عەشیرەتێکی سەربەخۆ نییە.

**ئیبراهیم ئەحمەد:** لەم بارەیەوە هیچ زانیاریەکی مێژوویم نییە.

**عەبدوڵلا ئۆجالان:** بە بڕوای من سەر بە عەشیرەتی دەڤەرەکە نین، بەڵکو موریدێکی تەریقەتی نەقشبەندین، لەوانەیە لە باکوور لە شەمزینانەوە هاتبن، بە دوای شوێنێکی نیشتەجێبووندا گەڕاون، دواتر لە گوندی بارزان نیشتەجێبوون و گووتوویانە؛ "عەشیرەتێکی سەربەخۆین"، بەڵام خەسڵەتی عەشیرەتیان هێندە بەهێز نییە، بۆیە مرۆڤ ناتوانێ بڵێ عەشیرەتن. دەکرێ بڵێین تێکەڵاویەکی عەشیرەتی و مەلایەتین. دۆخی بەمجۆرە بە گوێرەی واقیعی کوردستان هەیە، چونکە ئاغایەتی و شێخایەتی لە کوردستاندا بەهێزە، مەلایەتی و عەشیرەتگەریش بەهێزن. مرۆڤ دەتوانێ بڵێ بەدرخان بەگ ئاغایەک بووە، خۆی سەرۆک عەشیرەتە، نوێنەرایەتی خەسڵەتی ئاغایەتی دەکات. شێخ سەعیدیش سەرۆکی مەلاکانە، مەلای هەرە گەورەیە و دڵسۆزە. هەروەها سەید ڕەزاش تەواو سەرۆک عەشیرەتێکە. بەڵام دۆخی مەلا مستەفا و بنەماڵەکەی شتێکی زۆر جیاوازە. هەروەها لەلایەنی ئایینیشەوە بەهێز نییە. زەمینەی ئاغایەتی و زەمینەی مەلایەتی لای مستەفا بارزانی زۆر لاواز و سنووردارە. ئەمەش واقیع و ڕاستینەی کوردستانە. هەر بۆیە کەسایەتییەکی بەم جۆرە تەنیا

دەتوانێ یاری بە شێخایەتی، مەلایەتی و عەشیرەتگەریی و ئاغایەتی بکات.
کەسایەتی بەمجۆرە لە کوردستاندا کەسایەتییەکی زۆر سەیرە. ئەگەر کەسایەتی بەم جۆرە دەرفەتیان دەستکەوێ هەم یاریی بە ئایین دەکەن و خۆشیان بە زانای ئایینی نیشان دەدەن. یاریی بە سەرۆک عەشیرەتی دەکەن و ئاغاکانیش بە خۆیانەوە دەبەستنەوە. لێرەدا پێویستە خاڵێک دیاری بکەین، ئەم کەسایەتییە زۆر ترسنۆکە و تا دوا ڕادە یاری دەکات و کەسایەتییەکە هەر دەقیقەیەک شیمانەی گۆڕانی هەیە، چونکە بێ بناخەیە. سەرۆک عەشیرەتێک، کەسانی وەک بەدرخان بەگ و سەید ڕەزا و ئەوانیتر بەم جۆرە نین. بەڵام مەلا مستەفا و بنەماڵەگەرێتیەکەی یاریی بە عەشیرەت و مەلایەتی (شێخایەتی) و ئاغایەتی دەکات. بونیاد و پێکهاتەیەکی بەم جۆرەیە، هەر بۆیە یەکلابوونەوە لای مەلا مستەفا بوونی نییە. کوردایەتیەکەی ئەو پەسەند ناکەم. چەندە گەلی کورد دەناسێ؟ لەو بڕوایەدام کە بە هیچ جۆرێک نەتەوەپەروەری کورد لای ئەو بوونی نییە.
**ئیبراهیم ئەحمەد:** سەبارەت بە سیاسەت زۆر نەزان بوو، ماوەیەکی زۆر تێپەڕی تا توانیم تێیبگەیەنم "ئۆتۆنۆمی" چییە!

## بارزانیچێتی لە کوردستان

**عەبدوڵڵا ئۆجالان:** بێگومان زانیاریەکانی مەلا مستەفا سەبارەت بە سیاسەت زۆر لاوازە. هەروەها لایەنی نەتەوەییشی زۆر لاوازە. باوەڕناکەم هیچ شتێک لە کۆمەڵگەی کوردەواری تێگەیشتبێ؟ هیچ شتێک سەبارەت بە کۆمەڵگەی کورد نازانێ؟ لەوانەیە هەندێ شتی ئایینی لە جۆری (( قل هوالله))ی زانیبێ.

**ئیبراهیم ئەحمەد:** کاتێ مستەفا بارزانی هاتە سلێمانی زانیارییە ئایینیەکانی لە شێخ بابەعەلی فێردەبوو. هەروەها یەک – دوو زمانی دەزانی.

**عەبدوڵڵا ئۆجالان:** مەلا مستەفا؟ زانینی زمان واگرنگ نییە، وابزانم ئینگلیزیی دەزانی.

**ئیبراهیم ئەحمەد:** کاتێک مستەفا بارزانی چووە ڕووسیا، دواتر دار و دەستەکەی پەرتەوازە کران، ئەم پەرتەوازە کردنە تەنیا خەتا و تاوانی ڕووسیا نییە، بەڵکو تاوان و خەتاباری خۆشیەتی، چونکە کاتێ فەرماندەیەکی سۆڤیەتی لە ئازەربایجان پێشوازیان لێدەکات، لێی دەپرسێ: "ئایا ئینگلیزیی دەزانن؟" ئەویش لە وەڵامدا دەڵێ: "لە ڕووسیا پێویستم پێی نییە، نامەیەکی ئینگلیزیی بۆ کۆنسلۆسی ئەمریکا دەنووسم. پێشتر لە تاران پێیان گووتبووین، کاتێ لە تاران بووین نەماندەزانی ڕەوشی جیهان چۆنە، ئەمریکا دەرفەتی پێداین، بەڵام نەچووین. ئێستا داوا لە ئەمریکا

دەکەم دەرفەتمان پێبدات و مافی پەنابەری بە من و چەند کەسانێکی نزیک و دەوروبەرم بدات". بەم جۆرەش ستالین توڕە دەبێ و پەرتەوازەیان دەکات. بەڵێ سیخوڕە سۆڤێتیەکان بەوە دەزانن کە مەلا مستەفا پەیوەندی لەگەڵ دەوڵەتانی تر هەیە و ئەم زانیاریانەش بە حکومەتەکەیان ڕادەگەیەنن، حکومەتیش هەڵوێستێکی بەمجۆرە نیشاندەدات. ئەوەی ئەم بابەتەی بۆ باس کردین کەسی دووەمی سۆڤێت بوو؛ کاتێ چووین مەلا مستەفا بێنینەوە، ئەویش هاتبوو.

**عەبدوڵلا ئۆجالان:** ئەوەی لێرەدا گرنگە و بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا دەرکەوتووە ئەمەیە کە بۆچوونی سیاسی زۆر بەرتەسک و سنورداربووە. هۆکاری فێربوونی چەند وشەیەکی زمانی ئینگلیزیش لەپێناو خزمەتکردنی ئەمریکایە. ئەگەر لەو قۆناخەدا فێری زمانیش بووبێ لە پێناو ئەوە نەبووە کە کارێک بکات، بەڵکو لەپێناو کۆیلایەتییە. لێرەدا بە هیچ شێوەیەک یەکێتی سۆڤیەت ناناسێ، ستالین بینیویەتی ئەم پیاوە بە دوای ئەمریکادا دەگەڕێ، بە سیخوڕی داناوە و بڵاوەی پێکردوون. ئەمە ڕاستیەکەیە. لە لایەکی تریشەوە کەسێکی سیاسی و زانستی نییە. جێگای دیاردەیەک لەنێو دڵیدا نییە کە ناوی نەتەوەی کورد بێ، بە تەواوی لایەنی عەشیرەتگەریی لەپێشدایە، بگرە عەشیرەتیش نییە، بەڵکو بنەماڵەگەرێتییە، بەڵێ چەمکی بنەماڵەی مەلا مستەفا بەمجۆرەیە.

**ئیبراهیم ئەحمەد:** کاتێ ئێمە لە ئێران بووین مەلا مستەفا هەندێ لە هێزەکانی خۆی لە ناوچەی پێنجوێنی نزیک سنوور جێگیرکردبوو. لێمان کۆڵییەوە کە بۆچی وایکردووە، بۆمان دەرکەوت چاوەڕوانی ئەوە دەکات لە سنور بپەڕینەوە، تا لە کاتی پەڕینەوە لە ناومان ببات. هەروەها دیسان لە گوندێکی نزیک ناوچەی پێنجوێن گوندنشینێک بە ناوی مستەفا مەجید لەگەڵ نوێنەرانی چەند گوندێکی تر دەچنە لای مەلا مستەفا و پێی دەڵێن: "گەورەم، سەرۆکم، فەرماندە و پێشمەرگەکانت دەست بۆ ناموسمان، بۆ ژن و کچ و خوشکەکانمان درێژ دەکەن". ئەویش بەم جۆرە وەڵامیان دەداتەوە: "چی دەبێ؟ هیچ شتێک نابێ!، دەمانەوێ منداڵەکانتان وەک ئێمەی بارزانی بن! ئامادەم سەد دینار بدەم بەوەی ژنەکەی ڕفێندراوە، پەنجا دیناریش بدەم بەوەی کە کچەکەی ڕفێندراوە!". دوای ئەوەی ئەم گوندنشینە لە دیوەخانی مەلا مستەفا دەچێتە دەرەوە دەڵێ: "ئەگەر زۆر خراپیش بێت، بە دوای تورکێکەوە بڕۆین باشترە، نەک بە دوای مستەفا بارزانی".

**عەبدوڵلا ئۆجالان:** ئەم خاڵە شتێکی تر دەسەلمێنێ؛ ئەمە بنەماڵەگەرێتییە، بنەماڵەگەرێتی ماڵباتەکەی زۆر داڕووخاوە، بەردەوام دەیەوێ ژمارەی 'بارزانییەکان' زیاد بکات، تەنانەت بە دار و دەستەکانی دەڵێ: "بڕۆن ژن و کچەکانی پێشمەرگە و لادێییەکان بۆخۆتان بێنن". لەو بڕوایەدام کە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا ئەم دۆخە بەردەوامە. لە ڕاستیدا

ئەمە ئایدیۆلۆژیایەکە، ئایدیۆلۆژیایەکی زۆر کۆنەپەرست و پاشڤەڕۆیە. لە سەرەتای مێژووی مرۆڤایەتی کلان (تیرەی بەرایی) هەبوو؛ ئەم ئایدیۆلۆژیایە، ئایدیۆلۆژیای کلانە. بەر لە پێکهاتنی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بنەماڵەی بەمجۆرە پێکدەهاتن. لە هزر و بیرکردنەوە بێبەشن. کەسایەتی بەم جۆرە نە جێگای لە 'کۆمەڵگەی کۆیلایەتی' و نە لە 'کۆمەڵگەی فیودالی' و نە جێگای لە 'کۆمەڵگەی سەرمایەداری'دا نییە. تاکگەرایی و تاکڕەوییەکی زێدە لەم کەسایەتییەدا هەیە، لە هەمانکاتیشدا تاکڕەوییەکەی زۆر کۆنەپەرستە. خاڵێکی تریش هەیە: کاتێ بە داروودەستە و پێشمەرگەکانی دەڵێ: "باشتان کردووە، ئامادەمە پارە وەک قەرەبوو بدەم"، هەروەها دەڵێ: "با وەچەی بارزانیەکان زیادبێ، با دەوروبەرمان زیادبێ"، ئەمە نە عەشیرەتگەریی و نە ئاغایەتی و پادشایەتی، هیچیان نییە، بەڵکو بارزانییەتچێتییە! لە ناوەوە یاری بە هەرکەسێک دەکات جگە لە بنەماڵەکەی. ئەوانە عەشیرەتگەر نین، بەڵکو بنەماڵەگەرێتی دەکەن. لە ڕێگەی پیلانگێڕیی و پارە و هەڵپەرستی و گەلێک شێوازیترەوە یاری بە هەرکەسێک دەکەن.

مەلا مستەفا بە هۆشیاری نزیک دەوڵەتان دەبێتەوە، زیاتر گوێڕایەڵی دەوڵەتە گەورەکان دەکات. هەروەکو باستان کرد دەوڵەتەکانی بە بنەما دەگرت، ئەم دەوڵەتانە چییان گووتبووایە یەکەم هەنگاوی پەسەند کردن بوو. بەردەوام

لایەنگری بەهێزەکانی دەکرد. بۆ نمونە، ئێران بەهێزە پێی دەڵێ: "ڕێککەوتن تێکدە"، دەستبەجێ تێکی دەدات. لە ڕێی گوێڕایەڵی کردنی بۆ دەوڵەتە گەورەکان ویستویەتی خۆی مەزن بکات و هەموو ڕێچکە و شێوازێکی بۆ خۆی بە ڕەوا بینیوە. هەر شتێک پەسەند دەکات کە لە خزمەتیماڵبات و بنەماڵەکەیدا بێت، تەنانەت ئامادەیە لەم پێناوەدا پارەش بدات، بەڵام ئەگەر لە خزمەتی بنەماڵەکەیدا نەبێت، ئامادەیە مرۆڤی بێتاوانیش بکوژێت. پێویستە لەسەر مەسەلەی کوشتنی خەڵک لە لایەن مەلا مستەفاوە بوەستین: ئەوانەی دەیانکوژێ بە هۆی تاوانی دژ بە نەتەوە یان دژ بە پارتی نییە، بەڵکو لەبەر ئەوەی زیانیان بە ماڵبات و بنەماڵەکەی گەیاندووە، مرۆڤی بێتاوان دەکوژێ. ئەمەش هەڵوێستێکی کۆنەپەرستانەیە و تایبەت بە ئایدیۆلۆژیای تیرەی سەرەتاییە. ئەگەر یەکێک ئەندامی ئەم تیرە سەرەتاییە نەبێ دەکوژرێ و دەرفەتی ژیانی پێنادەن، ئەمەش رەوشێکی زۆر خراپە.

ماموستا چۆن ئەم رەوشەتان نەبینی؟ چۆن ئەم کەسایەتییەتان شینەکردەوە و هەڵتان نەسەنگاند؟ کەسایەتی مەلا مستەفا کەسایەتیەکی بنەماڵەگەرە، کەسایەتییەکی زۆر کۆنەپەرست و دواکەوتووە. کاتێ کە کۆمەڵگە پێکدێت سەرەتا کلان و تیرە پێکهاتن. ئەمانەش لە کوردستاندا تیرەیان بۆخۆیان ئاواکرد. لە دەرەوە پشتگیریان لێدەکرێت و بەمجۆر بەرێوە دەچن. لە سەدەی

بیستەمدا ئەوە چ مانایەک بۆ کوردان دەبەخشێ؟ تیرەیەک بەسەر کوردان دا دەسەپێنێ و دەیکەی بە سەرۆک. ئەمە مانای لەناوبردنی کوردانە. مردن و لە ناوچوونی کوردان بە هۆی ئەم سەرۆکایەتیەیە. ئێوە دەڵێن: "با بەشێوەیەکی زانستی مەسەلەکان هەڵسەنگێنین". بەڵام زانست و سیاسەت لای ئەو کابرایە بوونی نییە، ئایا لە ساڵی ١٩٤٧ ستالین شتێکی بەمجۆرە پەسەند دەکات؟ هەڵبەتە ستالین لە ناوت دەبات، واتە لە لایەنی سیاسییەوە ئەم پیاوە سفرە.

**ئیبراهیم ئەحمەد:** هەروەها ڕۆحیەت و ویژدانی مرۆڤایەتیش لە مستەفا بارزانیدا نەبوو؛ بۆ نموونە، فەرمانی کوشتنی خاڵی و سێزدە منداڵەکەی دەرخست "بنەماڵەی حەمەد ئاغای مێرگەسۆری". تەنانەت یەکێک لەو منداڵانە شەش ساڵان بوو، ئەویشیان کوشت.

**عەبدوڵلا ئۆجالان:** هۆی ئەمە چی بوو؟ مەسەلەکە تەنیا بۆ زۆرداریی مەلا مستەفا ناگەڕێتەوە، مەسەلەکە ئەوەیە کە لە دیدگا و تێڕوانینی تیرەگەریی بەولاوە شتێکیتر نازانێ. عەشیرەت مەزنە؛ تیرەکان مەزن دەبن، بەڵام سەد ساڵ دوای ئەوە عەشیرەت ئاوا دەکرێ. عەشیرەتەکانیش گەورە دەبن و چەند عەشیرەتێک دێنە لای یەکتر گەل پێک دێنن. گەل لە ئەنجامی بەیەک گەیشتنی چەندین عەشیرەت لەسەر بنەمای هەمان زمان و کولتور پێکدێت. قۆناخی پێکهاتنی گەل ماوەیەکی زۆر دەخایەنێ. لە ئەنجامی پێکهاتنی گەلیش

نەتەوە پەیدا دەبێ، نەتەوەش پشت بە یەکێتی و یەکپارچەیی خاک دەبەستێ.
لێرەدا مستەفا بارزانی چییە؟ خاوەنی کەسایەتییەکی مەزنی عەشیرەتگەریی نییە، مەحمود بەرزنجی شێخێکە و سەرۆک خێڵێکی مەزنە. هەروەها میر بەدرخان بەگ و ئاغایەکە هێندەی دەوڵەتێک مەزنە. شێخ سەعیدیش مەلایەکی مەزنە، هۆشمەندێکی گەورەی موسڵمانانە، لە نێو چەمکی ئوممەتی موسڵماندا نکۆڵی لە میللەتی خۆی ناکات و دڵسۆزە؛ دژی کەمالیزم دەوەستێت و ئەمەش هەڵوێستێکی ڕاستە. بەڵام با سەیری بنەماڵەی مەلا مستەفا بکەین، هیچ سەرۆک خێڵێک وەکو ئەمانە نییە؛ چونکە سەرۆک خێڵەکانیش خاوەن قسە و بەڵێنی خۆیانن. بەڵام بنەماڵەی مەلا مستەفا هیچ پەیوەندییەکی بە مانەوە نییە. تەنانەت ئاغایەکیش نییە.
میر بەدرخان بەگێکی زانا و تێگەیشتووە، بنەماڵە و منداڵەکانی خاوەن کولتورن، تەنانەت چەند پەرتووکێکیشیان نووسیوە. کەسایەتی مەزن لەناو ئەو بنەماڵەیە هەڵکەوتن. ئەمەش سەرچاوەی خۆی لەوە دەگرێت کە لە لایەنی سیاسی و کۆمەڵایەتی پێشکەوتوو بوون. بەڵام ئایا کەسایەتی مەزن لە ناو بنەماڵەی مەلا مستەفا دەرکەوتوون؟ شێخ سەعید مەلایە، بەڵام مەلایەکی دڵسۆز و ڕاستگۆیە. ئەویش نەقشبەندییە. ئێستا کوڕێکی هەیە، ئەم کوڕەی هەزار ئەوەندەی ئەوانە تێگەیشتوو و سیاسییە، لە

لایەنی شیکردنەوە و هەڵسەنگاندنی مەسەلەکان زۆر بە توانایە. بەڵام مەلایەتی لەلای مستەفا بارزانی نییە، تەنانەت عەشیرەتگەریی و ئاغایەتیش بوونی نییە، واتە تەنانەت یەکێک لە بنەماکانی مەلایەتی نازانێ، بەڵام خۆی کردووە بە سەرۆکی کوردستان، هەربۆیە دەرەنجامەکەی ژێرکەوتنە. سەیرکەن دەڵێ: 'بڕۆن ژنان و کچانی گوندنشینان بێنن، با منداڵ دروست ببێ و بارزانییەکان زۆر بن'، لەم پێناوەدا پارەش دەدات. ئەمە لە نەریتی عەشیرەتدا بوونی نییە، ناکرێ و ناشێ سەرۆک عەشیرەتێک ئەمە بۆ عەشیرەتەکەی بکات. نە لە عەشیرەتگەریی و نە لە ئاغایەتی ناتوانی ئەوە بکەی، لە پاشایەتیشدا هەرگیز نابێ. ئەمە یاسای کلان و تیرەی سەرەتاییە. ئەمە شتێکی زۆر سەیرە. دەبووایە لە بەرامبەر ئەم دۆخە تێکۆشان بکەن. ئەمە یاسایەکی چوار هەزار ساڵ بەر لە ئێستایە، یاسایەکی قۆناخی باوکسالارییە. لێرەدا تاوانی منداڵێکی شەش ساڵان چییە؟ ئەم کابرایە ویژدانی نییە.

مەلا مستەفا بۆ خۆی چەندین کەسی کوشت، چەندین عەشیرەتی تاڵانکرد. بەگوێرەی ئەم ئایدیۆلۆژیایە، ئەوانەی لەدەرەوەی تیرە و بنەماڵەی ئەون، مافی ژیانیان نییە. ئەم خاڵە تۆزێکی تر ڕوون بکەینەوە: کوردەکان نە تەواو کەوتنە ژێر کۆنترۆڵی ئاغایەتی و نە یەکێتی کۆنفدراسیۆنی عەشیرەتەکان پێکهات، لە کۆنەوە لە سەردەمی میدییەکان شتی لەم جۆرە هەبوون، بەڵام تێکشکێنرا و ڕووخێنرا.

مرۆڤێکی وەک حەزرەتی محەمەدیش لە کوردستان دەرنەکەوت. ئایا بارزانی دەتوانێت وەک پێغەمبەرێک بکات؟ خۆی وەک پێغەمبەر و خودا ناساند بوو؛ شێخ ئەحمەد خۆی وەک خوداوەندێک دەبینی. بەڵام پێغەمبەران بەم جۆرە نەبوون. خوداوەندێکی ساختە و پێغەمبەرێکی ساختە خۆی کردۆتە سەرگەورەی کوردان و خۆی سەپاندووە.

هەر لە بەر ئەوەی ئەم خوداوەند و پێغەمبەرە ساختەیە، تیرە و بنەماڵەی چوار هەزار ساڵ بەر لە ئێستای بۆ خۆی بەبنەما گرت، هەروەها لەبەر ئەوەی شۆڤینیست بوو، نەیتوانی هیچ شتێک بکات. ئەوەی یارمەتی ئەوە بدات، ئەویش ساختەکارە. ناتوانین مستەفا بارزانی بە مەلایەکی مەزن، تەنانەت بە مەلاش دابنێین؛ کاتێ ئەمانە دەڵێم لە بەر ئەوە نییە کە دژایەتی بۆچوونەکانی دەکەین و ململانێیەکی سیاسی لەگەڵدا دەکەم؛ بەڵکو کاتێ ئەم کەسایەتییە شیدەکەینەوە و هەڵدەسەنگێنین واقیعێک دەخەینە ڕوو. مەلا مستەفا ئەو هێز و توانایەی نییە سەرۆکایەتی عەشیرەتێک بکات، چونکە سەرۆک عەشیرەتێک پێویستە خاوەن ویژدان بێت، بەڵام ئەو کابرایە خاوەن ویژدان نییە. مەلایەتی و ئاغایەتیەکەشی ساختەیە.

ئەی بۆچی خۆی وەک سەرۆکی کوردان سەپاند؟ پێویستە هەڵوەستە سەبارەت بەم مەسەلەیە بکەین، لە زۆر ڕووەوە لە کوردان تێناگات. بۆ نموونە، عەشیرەتە عەرەبەکان هەن، زۆر ڕەسەن و یاخین، گرێدراوی نەتەوەکەیانن. بەڵام ئەمە

لای کوردان نییه، هەست و داخوازی کوردان بۆ بوون بە دەسەڵات پەرەی نەسەندووە، هەر بۆیە پارچە پارچە بوون. بۆچی زانا ئایینیەکانی کورد زۆربەیان ساختەن؟ چونکە پەیڕەوی لە واقیع و ڕاستینەی دوژمنەکانیان دەکەن. ئایینی ئیسلام لە ئێران لە چوارچێوەی بەرژەوەندی گەلی ئێران لە ژێر ناوی شیعەگەریتی ڕێکخراوە. هەروەها تورکەکانیش بە یەکانگیرکردنی ئیسلامییەت و نەتەوایەتی تورک، دەوڵەتی مەزنیان ئاواکردووە. بەڵام لای کوردان تەواو ڕەوشێکی پێچەوانە لە ئارادایە، تەنیا بۆ ئەوە هەن کە خزمەتی بیانییەکان بکەن. لە بنەڕەتدا پێکهاتن و هەبوونی ئایین لەپێناو مرۆڤە، بەڵام کوردان بەم جۆرە بیرناکەنەوە، فەلسەفەی زاڵ و باڵادەست ئەوەیە کە دەڵێ: "کوردان لە پێناو خزمەتکردنی ئایین هەن"، هەر بۆیە دەبینین کە کوردەکان لە خزمەتی سوڵتانە تورک و عەرەب و فارسەکاندا بوون. ئەگەر بیانخواستبووایە دەیانتوانی سوپای خۆشیان دابمەزرێنن، بە بڕوای من بەدرخان بەگ لایەنی نەتەوەیی هەبووە و خواستوویەتی شتێک بکات. هەروەها لە ئایدیۆلۆژیا و فەلسەفەی ئەحمەدی خانیشدا نەتەوایەتی هەیە و دەخوازێ نەتەوەی کورد بکاتە یەک. لە سەردەمی بەدرخان بەگ دەکرا هەنگاوی مەزن هاویشترابووایە، ئەگەر شێخ سەعید سەرکەوتنی بە دەست هێنابووایە، بۆی هەبوو هەندێک هەنگاو لە قازانجی گەلی کورد بهاوێژرێت، ئەگەر سەرکەوتنییان بە دەست هێنابایە

ناچار دەبوون هەنگاوێکی بەمجۆرە بهاوێژن، وەلێ شکستیان هێنا.
با تۆزێکیش هەڵوەستە لەسەر بزووتنەوە نەتەوایەتییە کۆمەڵایەتی و سیاسییە هاوچەرخەکان بکەین. بەر لە هەموو شتێک پێویستە ئاماژە بەو حەقیقەتە بکەین کە تاکی کورد یاریی زۆری پێکراوە و لە کەسایەتی دراوە؛ کەسایەتیەکەی تێکشکێنراوە و ڕووخێنراوە؛ واتە کۆمەڵگەی کورد تێکشکێنراوە. نەک تەنیا بنەماڵەی مەلا مستەفا و پارتەکانی تر، تەنانەت ئەو شتانە لە ناو پەکەکەشدا هەن. بەرامبەر بەوە تا دوا ڕادە تێدەکۆشم. هەڤاڵێکم هەیە، یەکێکە لە هەڤاڵە یەکەمەکانی سەردەمی گرووپ، لە دەڤەری دێرسیمەوە هاتبوو؛ ڕۆحیەتی عەشیرەتیشی نەمابوو، لە قوتابخانەکانی دەوڵەتی تورکدا گەورە ببوو. دوای ماوەیەک بینیم کە بە گوێرەی بیر و هزری پارت و کوردبوون بەرێوە ناچێت. کار و خەباتی سیاسی و پارت مەزن دەبێ، بەڵام ئەو خۆی بە خێزان وماڵباتەوە بەستۆتەوە. ئێمە لە ساڵی ١٩٧٢ دەستمان بە کار و خەبات کرد، کاتێ گەیشتینە ساڵی ١٩٨٠ بینیم ئەو هەڤاڵەمان دەستی لە خۆی بەرداوە؛ چەندە بارمان قورستر دەبێ، ئەم هەڤاڵەمان یان بیر لە خۆکوژیی دەکاتەوە، یان خۆی بە خێزان و ماڵباتەوە دەبەستێتەوە؛ خۆی لاواز و بێ هێز کردبوو، بەم دۆخەشیەوە زیانی بە پارت و ڕێکخستن دەگەیاند. هەڵوەستەی زۆرمان لەسەر کرد، تا ئێستاش پێیەوە

سەرقاڵین. ئەگەر ڕێگریمان لێ نەکردایە، ئەنجام وەک ئەوەی مەلا مستەفا دەبوو؛ واتە لە پێناو خستنەوەی منداڵ (وەچە)یێک، تەواوی منداڵانی نەتەوەیەک دەمرن. هەرگیز ئەمە پەسەند ناکرێ و نابێ ڕووبدات. بارزانیەکان بۆچی دەستدرێژی دەکەنە سەر ژنانی گوندەکان؟ بۆ ئەوەی منداڵەکانیان لە ڕەچەڵەکی بارزانی بن و بچنە ڕیزی خۆیان. ئەمە بابەتێکی گرنگە. پێشتریش ئاماژەم پێکرد، ژیانی کۆمەڵایەتی بەبێ منداڵ نابێ؛ بەڵام ئێمە باسی کەسایەتی پێشەنگ و سەرۆکایەتی دەکەین. ئەگەر تۆ خۆت بە سەرۆک دادەنێی، چۆن دەتوانی بڵێی با منداڵانی نەتەوەیەک بمرن، بەڵام بارزانی منداڵ و وەچەی زۆر بێ!

خاڵێکی تریش ئەوەیە؛ وابزانم یەکێک لە براکانی مەسعود بارزانی کە لە ئەورووپایە (دڵشاد) گووتوویەتی: "کوردایەتی باشە، بەڵام ئەوەی باسی لێدەکەن، لای مەسعود وەک پەڕۆیەکی ژێر پێڵاو وایە". پارچەیەک پەڕۆ چ مانایەک دەبەخشێ؟ لە ژێر پێی، مانای چییە؟ کوردایەتیەکی بەمجۆرە با هەر نەبێ و نقووم ببێ. ئەگەر کەسایەتیەکەی کۆیلە نەبووایە پەسەندمان دەکرد، دەمانگووت: "بگرە وەک پارچە پەڕۆیەک پێڵاوەکانتی پێ خاوێن بکەرەوە". بەڵام کابرا کەوتووە، دەستدرێژی بۆ هەموو شتێکی گەل دەکەن، بە زۆر خۆیان دەسەپێنن و زۆرداریی دەکەن، یەکێکیان دەستدرێژیکردنە سەر کچی خەڵکی پەسەند دەکات و دەڵێ: "با بارزانییەکان زیاد بن"، ئەوەکەی تریشیان دەڵێ:

"کوردایەتی پەڕۆی ژێر پێی مەسعودە". بەمجۆرە نرخ و بەهاکانی گەل دەناسن و ڕێزی لێدەگرن. ئەگەر سەرۆک بەمجۆرە بێت و بەم جۆرە ڕێز لە گەل بگرێ، لەوێدا نەتەوایەتی کۆتایی پێدێت.
خاڵێکی تریش مەسەلەی بازرگانییە. ئەگەر تۆ ڕۆشنبیرێک بیت، دیسان بتکڕێ و بتفرۆشێ، بۆچی؟ بۆ ئەوەی پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ گەل ڕێک بکات، ئەگەر خاوەن هێز و توانا بیت، دەخوازێ بتکڕێ، تا خۆی ببێتە خاوەنی هێز و پشتگیریی بە دەست بێنێ. ئەگەر دیپلۆمات و زمانزانی دەتکڕێ و دەتفرۆشێ تا پەیوەندی لەگەڵ ئەمریکا و دەوڵەتانی تر ببەستێ.
بابەتێکی دیکە کە لە ناو پەکەکە دژی وەستامەوە، سەبارەت بە پرسی ژنە. ئەو هەڤاڵەی لە سەرەوە باسم کرد، پێم گووت؛ "لە پێناو ژنێک و چەند منداڵێک، بۆچی پارت و ڕێکخستنت پشتگوێ خست؟ لە شوێنی خۆت دانیشە". ئایا دەکرێ شتی لەو جۆرە لە ناو پارت ڕوووبدات؟ من داوای لێدەکەم کەسایەتیەکی نەتەوەیی- نیشتیمانی بێت و کار و خەباتی سیاسی بکات، ئەویش دەچێ سەرقاڵی بابەتی چەند منداڵێک دەبێ! ئێمە ئەو هەڤاڵەمان ڕاکێشا و لەو دۆخە ڕزگارمان کرد، بەڵام ئەو ژنە لەگەڵماڵباتەکەی چووە لای دوژمن. دوژمن دەیگووت؛ "با بێ خانووی بۆ دروست دەکەین". منیش نامەیەکم بۆ نووسی، پێم گووت؛ "ناشێ تۆ مرۆڤێکی هێندە خراپ بیت، ناکرێ مرۆڤ لە پێناو ژنێک

وەها بکات، وازی لێ بێنە. ڕێز لە ژن بگرە؛ بەڵام دەبێ خۆت و ژنیش لەو ڕەفتار و کردەوانە بە دوور بگری کە زەمینەی ڕێکخستن تێکدەدات. خۆت لە بواری ڕێکخستنی و کار و خەباتی سیاسیدا بەهێز بکە، دەستبەرداری خۆت مەبە. نەک لە پێناو خێزان و ژن و منداڵان، بەڵکو پێویستە لە پێناو گەل و وڵات تێکۆشان بکەی. ئەندامێتی پەکەکە گرنگە؛ لە پێش خێزان، عەشیرەت و منداڵەوە دێت. ئەگەر لە ناو پەکەکەدا پێش هەموو شتێک بڵێی (منداڵەکەم، ژنەکەم، خێزانەکەم) ئەوکاتە سەرکەوتن بەدینایەت. ئەم خاڵە زۆر گرنگە. ئەم دۆخە لەناو کۆمەڵگەی کورددا بەربڵاوە. بەڵێ ئەمانە بنەماکانی ڕێبەرایەتی ئێمەن.

بە هەڵە لێم تێنەگەن؛ نکوڵی لە خێزان، منداڵ و پەیوەندی ناکەم. ئەوەی گرنگە، تێگەیشتنی ئایدیۆلۆژیایە؛ چونکە ئایدیۆلۆژیا زۆر گرنگە. ئایدیۆلۆژیای بنەماڵەی مەلا مستەفا چی بوو؟ تێگەیشتنی ئایدیۆلۆژیاکەیان زۆر گرنگە. لێرەش بە هەڤاڵانم گووت؛ دەتوانن بچن بۆ خۆتان هاوسەرگیریی بکەن. بەڵام ئەو ئایدیۆلۆژیایە مرۆڤ دەکوژێ. دوای ئەوەی ئایدیۆلۆژیای بنەماڵەی بارزانیت کوشت؛ کێ چی دەوێت با بیکات، چۆنت پێخۆشە خۆشەویستی و هاوسەرگیریی بکەیت، بیکە. بەڵێ شێوازی من بەمجۆرەیە. نابێ لە پێناو خێزان، منداڵ و ژنەکەت یاری بە پارت و چارەنووسی گەل بکەی. چونکە ئەو خاڵە بۆتە هۆکاری ژێرکەوتن و شکست.

بنەماڵەگەریتی و ئایدیۆلۆژیای بنەماڵەی مەلا مستەفا بووە هۆی پارچەبوونی گەلی کورد. ئەوە لای ئێمە گرنگ نییە ئایا بە شێوەیەکی بابەتی یان خودی خائینە؟ ئەگەر ببێتە کۆسپ و ئاستەنگ هیچ جیاوازیەکی نییە. سەرۆک تیرەی سی-چل ساڵ هەتا بەر لە سەد ساڵ پێش ئێستات کردۆتە سەرۆکی خۆت، ئایا دەشێت ببیتە خاوەن قەوارە و دەوڵەت؟ ئایا دەشێت ڕزگاری نەتەوەیی بەدیبێت؟ نەخێر. چونکە هیچ فیکر و هزرێکی دەوڵەت و گەل لای ئەو نییە. تەنانەت هزرێکی عەشیرەتگەریی و ئایینیش لای ئەوان بوونی نییە. تەنیا بیر لەوە دەکاتەوە کە چۆن بنەماڵەکەی فراوان بکات. دەڵێ هەموو شتێک بۆ من بێت، هێندەی بنەماڵەکەی مەزن بێت، بەو ئەندازەیەش سەرۆکایەتی دەکات، ئەمە تەنیا لای بنەماڵەی مەلا مستەفا وانییە، بەڵکو کارەکتەر و تایبەتمەندییەکی کۆمەڵگەی کوردە.

هەربۆیە لەناو پەکەکە دژی ئەوە وەستام. چونکە سروشتی ئەم ئایدیۆلۆژیایە بەمجۆرەیە و لەناو کورداندا زاڵە. ئەمە تەنیا لەناو ئێوەدا دەرنەکەوتووە، بەڵکو لەناو ڕیزەکانی ئێمەشدا شتی لەم جۆرە دەرکەوتوون. ئەمە بابەتێکی گرنگە و یەکێک لەو بابەت و پرسە سەرەکیانەیە کە پێویستە شیبکرێنەوە. ئەگەر ڕێوشوێنی تایبەتمان نەگرتبایە بەر، پەرێشان دەبووین. هەربۆیەش هەڵوەستەی زۆری لەسەر دەکەین. ئێمەش دووچاری بابەتێکی لەم جۆرە هاتین. ئێمە لە پێناو ڕاکێشانی (کەسیرە یلدرم) بۆ ناو کار و خەباتی

ڕێکخستن پەیوەندیمان لەگەڵ بەست. بەڵام ئەگەری پەیوەندی ئەو ژنەمان لەگەڵ دەوڵەت ڕەچاو کرد، بۆیە زۆر وریا و هەستیار بووین. لێرەدا خاڵێکی تریش هەبوو؛ ئەگەر ژنەکە و بنەماڵەکەیم بە بنەما بگرتایە، ئەوا کار و خەباتی سیاسیم دەوەستا. دەیانویست پرسی کورد و دۆزی نیشتیمانی کوردان ژێر پێ بخەم و هەڤاڵانی خۆشم ناشیرین بکەم. ئەوکاتە داوایان دەکرد، هەنگاو بە هەنگاو خێزان وماڵباتەکەم بخەمە خزمەتی دوژمنەوە. بەمجۆرەش ماڵباتی خۆی بەرز دەکردەوە و هەڤاڵانی منیشی بچووک دەکردەوە. پارت (پەکەکە)ی بچووک دەکردەوە و پاشەکشێی پێدەکرد. وەک جاران کوردستانی تەسلیم بە دوژمن دەکرد.

**ئیبراهیم ئەحمەد:** ڕزگاری کوردستان تەنیا لە ڕێگای گرێدانی تاک و کەسایەتی بە وڵاتەوە بەدی دێ. بە هیچ ڕێگایەکی تر نابێ. گەورەترین خۆشەویستی، خۆشەویستی نیشتیمانە، زیادکردنی ژمارەی ژن و پیاو و منداڵانی کورد، بە واتای زیادکردنی ژمارەی کۆیلەکان دێت. چونکە گەلی کورد بە خۆی کۆیلەیە، کاتێ ژمارەکەی زیاد دەکەین، واتە ژمارەی کۆیلەکان زیاد دەکەین، گرێدان پێویستە بە وڵات و ڕزگاری نیشتیمانەوە بێت، لە دوای ڕزگارکردنی نیشتیمان دەتوانین هەموو شتێک چارەسەر بکەین. خۆشەویستی ڕاستەقینە ئەوەیە کە ئەم کۆیلانە ئازاد بکەیت.

**عەبدوڵلا ئۆجالان:** بەڵێ مامۆستا ئەمە ڕاستە. هەر لە بەر ئەمەیە کێشە و گیروگرفتەکان سەختن، با بنەماڵەی بارزانی بە لاوە بنێین، ئەمە کێشەی سەختی ناو خودی PKK شە. هەر کەسێک دەخوازێت وەکو شێوازی ژیانی کۆن بژیت. هەندێک لە کچان و پیاوان بۆ کەیف و ئارەزووی ساتێکی خۆیان دەخوازن پارت شکست بێنێ. باسی دۆخی ئەو هەڤاڵەم کرد؛ لە پێناو ژنێک تەواوی مەسەلەکانی وڵات و پارت و تێکۆشان بە لاوە دەنێ. نەک تەنیا ئەو هەڤاڵانە، تەنانەت ویستیان منیش بخەنە ناو دۆخێکی بەمجۆرەوە. سەیرم کرد فاتمە (کەسیرە یڵدرم) بە ڕک و کینێکی مەزنەوە هێرش دەکاتە سەر پارت؛ بێ ڕێزی مەزن بەرامبەر بە شێوازی پەیوەندیەکانی پارت دەکات؛ لە جیاتی پرسی کوردستان، بەردەوام پرسی تاکخوازی دەوروژێنێ. هەربۆیە دەستبەجێ گووتم ئەمە دەبێتە هۆکاری تێکشکان و ژێرکەوتنمان. دەیویست من بە خۆیەوە گرێ بدات. هەربۆیە هەندێ تەدبیر و ڕێکارم گرتەبەر؛ ڕۆژانە حیساب و لێکدانەوەی خۆمم دەکرد. ئەو ژنە چییە؟ پەیوەندی بە خێزانەوە چییە؟ پەیوەندی ئەم خێزانە لەگەڵ دەوڵەتدا چییە؟ ئەو ئەنجامەی پێی گەیشتم ئەوە بوو: ئەگەر من پیاوێتی کوردی کۆن، مێردایەتی و پیاوێتی کلاسیک لە خۆمدا نەکوژم، ناتوانم PKK و کوردایەتی بەڕێوە ببەم. پێویستی ئەوەمان بینی بەرامبەر بەم واقیعەی ژن PKK بەهێز بکەین. بۆم ڕوون بۆوە ئەگەر بێتو یاسا باو و

کۆنەکانی سەبارەت بە ژن تێک نەشکێنین، نە پارت دەمێنیت و نە کوردایەتی.
هەڵبەتە لە ناو پارتیشماندا هەڵوێست و تێڕوانینی بەمجۆرە لە کەسێتی هەندێ لە هەڤاڵانماندا دەرکەوت. عوسمانی براشم چەند کچێکی لە دەوروبەری خۆی کۆکردبوویەوە، هاتنە ئێرە بینیمن. سەیرم کرد ئەویش دەیەوێ ئەم جۆرە شتانە بکات. ئەو هەڤاڵەی باسمان کرد لە ساڵی ١٩٨٠ وای کرد، عوسمانیش لە سەرەتای ١٩٩٠ کان. سەیرم کرد پارتیمان لە دەست دەچێ. هەروەها لە هەڤاڵێتی و برایەتی من تێناگات. پێم گووت؛ وەک خۆشت ئاگاداری "یاخیبوونی سەرەتام بەرامبەر بە باوک، برا و خێزان بوو". بەلام بینیم نایەوێ تێ بگات؛ لە وەلامدا دەڵێ: "من لە مەیدانەکانی شەڕدا ماوم، ناوبانگم دەرکەوتووە و هەرکەس دەمناسێ و گەورە بووم". سەبارەت بە منیش دەڵێ: "لە دۆخێکی زۆر سەختدایە، تەنانەت ناتوانێ هەناسەش بدات". چوو کەوتە ژێر کۆنترۆڵی هێزە دەسەلاتدارەکانی باشووری کوردستان. چی پێ دەڵێین، پێچەوانەکەی دەکات. پێمان گووت؛ "تۆ دەتوانی هەندێ پەیوەندی و تەنانەت ڕێککەوتن لەگەل تاڵەبانی پەرە پێبدەی"، ئەو دەیەوێ پەیوەندی لەگەل بارزانی پەرە پێبدات. مەسعود بارزانیش لە ڕێگای ئەوەوە دەیەوێ یاری بکات. کاتێک ئاگاداریشی دەکەینەوە، دەڵێ: "بۆچی ناتانەوێ خۆم گەورە بکەم". دەیەوێ یاسای کوردایەتی کۆن و کلاسیک بەسەر ئێمەدا بسەپێنێ؛ دەیەوێ

بڕیارێک بدەین کە ڕێگە لە پێش هاوسەرگیریی بکاتەوە. مەسعود بارزانیش دەیەوێ بیخەڵەتێنێ. بەڵام ئەویش گوایە خۆی بە خاوەن کەسایەتیەکی بەهێز دادەنێ.

هەڵبەتە ئێمە هەڵوەستەمان لەسەر ئەو دۆخە کرد؛ لە میانەی میکانیزمەکانی ڕێکخستن، دادگایی کرا و سزای پێویستی بۆ بڕایەوە. هەربۆیە بارزانی دەڵێ: "سەیرکەن ئاپۆ دەیەوێ براکەی خۆی بکوژێ". بێگومان شتێکی لەم جۆرە لە ئارادا نییە. ئێمە تەنیا دەمانەوێ هەڵوەستە لەسەر مەسەلەکانی پارتی "حزب" بکەین و دۆزی نەتەوایەتی بەهێز بکەین. ئەویش پەیوەندییە خێزانی و دەرەبەگایەتیەکان دەسەپێنێ. تەنانەت بە یەکێک لە هەڤاڵانی کچی گوتبوو: "وەرە با ڕایکەین". هەروەها دەڵێ: "خوشکێکمان لە باکووری کوردستانە، با بانگی بکەین و ئەویش ببێتە بەرپرسی ژنان". ئەمەش بۆ پەردەپۆشکردنی چەمکە چەوتەکانی سەبارەت بە ژنەوە زەق دەکاتەوە. هەربۆیە دەستبەجێ ئەم دۆخەمان شیکردەوە و گووتمان ئەوە کوردی کۆنە و هەموو شتێک ئاشکرا بووە. جیاوازی ئێمە لەگەڵ کوردی کۆن ئەوە بوو، کاتێ کاری ڕێکخستنمان دەکرد، پەیوەندیمان لەگەڵ کوڕان و کچانی ئەو ماڵباتانەدا پەرەپێدا کە لەگەڵ ماڵباتی ئێمەدا نەیار بوون. بەڵێ بەمجۆرە خۆمانمان گەورە کرد.

کاتێ عوسمان وایکرد، بە ڕاشکاوی پێم گووت؛ "برایەتی و هەڤاڵێتی تۆ بە گوێرەی بۆچوونی کۆمەڵگەی کۆنە؛ ئەمەش

لەناو پەکەکەدا گەورەترین مەترسییە". هەروەها پێم گووت؛ "دەتەوێ ببیتە خاوەن ژن و منداڵ، بەڵام منداڵی بەمجۆرە وەک ئەو تەماتە وایە کە لە زەوییەکی وشکهەڵاتوودا پێ بگات". هەروەک مامۆستاش ئاماژەی پێکرد، ئەمەش مانای زیادکردنی ژمارەی کۆیلەکانە؛ کۆیلەش هیچ نرخ و بەهایەکی نییە، ژنەش لەسەر ڕێگەی خیانەتە.

عەلی حەیدەر قەیتان هەڤاڵێکی زۆر دڵسۆزمانە، لە ئاخافتنێکیدا دەیگووت؛ "حەزرەتی عیسا گووتوویەتی، ئەگەر بخوازن عیساتان خۆشبوێت پێویستە دەست لە خۆشەویستی ژنان بەردەن". بەڵام ئێمە لە ناو PKK دا مەسەلەی خۆشەویستیمان پێشخست. خۆشەویستی لە ناو PKKدا مەزنکردنە؛ مەزنکردنە لە ڕێگەی سیاسەتەوە. واتە ئەو مەزنکردنە بە گوێرەی شێوازی تیرەگەرێتی سەرەتایی و بنەماڵەگەرێتی بارزانی نییە. بەڵکو مەزنکردنێکە لە ڕێگەی قارەمانێتی، مەزنکردنێکە لە ڕێگەی نەتەوایەتی و نیشتیمانپەروەری و خۆشەویستی گەل.

ئەگەر مرۆڤ لە خزمەتی گەل و وڵاتی خۆیدا بێت، بەهایەکی هەیە. پارتیش نرخ و بەهای پێدەدات، هەر بۆیە گووتم؛ پێویستە چەمکی کۆنی خۆشەویستی و پیاوێتی و مەزن بوون بە لاوە بنرێت. بە دڵنیاییەوە کاتێ خۆشەویستیەکی ئاوا مەزن بخوڵقێنرێ، مەترسی نامێنێ و لەناو دەچێت. ئەو کاتە دەبێتە وڵاتپارێز و ژەنەڕاڵ، دەتوانێ تا دوایی سەربازەکانی خۆی خۆش بووێت، مەرد دەبێت و

تا دوا هەناسە لەگەڵ پارتدا دەبێت. لێرەدا عەشیرەتگەریی و ناوچەگەریتی بوونیان نییە، بەڵکو نەتەوایەتی هەیە. **لە ناو پەکەکەدا جێگای عەشیرەتگەریتی و پارچەگەریتی و ناوچەگەریتی نابێتەوە.** لە نێو پارتدا تەنیا گەل و نەتەوە و مرۆڤایەتی بوونیان هەیە. لە شەڕ و تێکۆشانیشدا تەنیا قارەمانێتی هەیە. ئەگەر کوردایەتییەکی بەمجۆرە بخوڵقێنیی، کوردستان ڕزگار دەکەیت. ئەگەر بێتو تۆ حەقیقەت و ڕاستییەکان زاڵ و جێگیر بکەیت، کێ چی دەڵێت با بڵێت، چی دەکات با بیکات، ئیتر تەنها ڕاستییەکان بەڕێوە دەچن. ئەگەر ئەم چوار بنەما گرنگەت جێبەجێ کرد، ئیتر سەرکەوتن بە خۆی بەدی دێت.

ئێستا بۆچی مەسعود بارزانی دژی ئێمە شەڕ دەکات؟ تەنانەت بۆچی لە ناو پەکەکەشدا تێکۆشانێکی بەمجۆرە هەیە؟ ئەمە تێکۆشان و ململانێی نێوان کۆمەڵگەی نوێ و کۆمەڵگەی کۆنە. واتە شەڕی چینایەتییە. کۆمەڵگەی کۆن تێکدەشکێنین و کەسایەتی نوێ دەخوڵقێنین. مسۆگەر لە ناو PKKدا هەندێ هەنگاو لەم لایەنەوە هاویشتراوە. سەرکەوتنی سەرۆکایەتی و ئەندامێتیPKK گرێدراوی ئەم چوار خاڵەیە کە ئاماژەم پێکردن. ئەوانەی تر هێندە گرنگ نین؛ ئەوە گرنگ نییە کە چەند کەس پشتگیریمان لێدەکات و چەندمان پارە هەیە و چەکەکانمان چین و چەندن، هەروەها ئەمەش گرنگ نییە کە پەیوەندییەکانمان تا چ ڕادەیەک فراوانە، ئەوەی گرنگە ڕێبەرایەتییە؛ ئەگەر ڕێبەرایەتی و

سەرۆکایەتی ڕاستەقینە دەرکەوت، ئیتر تەواوی ئەوانەی تر چارەسەر دەکرێن.

مامۆستای هێژا ئیبراهیم ئەحمەد، ئایا دەتوانن چەند شتێکیش سەبارەت بە دوای ساڵی ١٩٧٥ بڵێن؟ باسی YNKتان کرد، وابزانم ئەوە قۆناخێکی نوێ بوو. قۆناخێک بوو لایەنی نەتەوەیی و گەلەری و سیاسی خۆی هەبوو. خۆی ناچار دەبینێ بەرەو پێکهاتەیەکی بەمجۆرە هەنگاو بهاوێژێ. لە قۆناخێکی زۆر تەنگ و ناسکدا سەرۆکایەتی YNKدەرکەوت. لە قۆناخێکی وادا سەرهەڵدەدات کە لە لایەک ئەمریکا و لە لایەکی تریش سۆڤیەت هەیە، هەروەها ئێران و دەوڵەتانی تریش هەن. تەماشا دەکەین دەبینین ئەو کات سەرکردایەتی YNK فیوداڵ و عەشیرەتگەریی نییە، نیشتیمانپەروەری تێدا هەیە، تا ڕادەیەک بۆ سۆسیالیزم و نەتەوایەتیش کراوە بوو. بەڵام گۆرەپانی جوڵانەوەکە زۆر بەرتەسک و سنووردار بوو. بارزانی YNKی مەحکومی ناوچەی سۆران کردووە. هەروەها لە لایەک ڕژێمی ئێراق، لە لایەکی تر ئێران، لە لایەکی تریش شیوعیەکان هەن. لێرەدا زۆر زەحمەتە بە شێوەیەکی بەردەوام و ڕۆژانە پەیڕەو لە تاکتیک بکرێت.

ئەگەر مرۆڤ مامۆستا و جوڵانەوەکەی مام جەلال نەناسێ، لەوانەیە بەرەو شیکردنەوە و هەڵسەنگاندنی چەوت بڕوات. بۆچی بەمجۆرە ڕەفتارتان کرد؟ مایەی تێگەیشتنە، هەلومەرجە بابەتییەکان ڕێگە نادات، تا ڕادەیەک

ناچارە بەمجۆرە بجوولێتەوە، بەڵام دواتر زۆر سنووردار و بەرتەسک دەبێتەوە. لەو حاڵەتەدا پێویستە هەندێ شت بکرێ. کاتێک تەنگەتاو کراون، ویستویانە بەرەو باکووری کوردستان یان خۆرهەڵاتی کوردستان بڕۆن. بەڵام دەرفەت و تواناکاری پێویستیان نییە. بۆ نموونە عەلی عەسکەر و هاوڕێکانی لە ناوچەی چەلێی دەڤەری هەکاری شەهید کران. ئایا تیرۆرکردنی ئەو تێکۆشەرانە هیچ پەیوەندیەکی بە نیشتیمانپەروەریەوە هەیە؟ هاتنیان بۆ دەڤەری بەهدینان بە ئامانجی پەرەپێدانی تێکۆشان و بەرخودانی مەزنە لە پێناو میللەتی کورد. ئامانجی تریان نەبوو؛ ئەمە حەقیقەتەکەیە. کاتێ لە ناو خاکی ئێرانیش بوون داوای شتی باشتان بۆ کوردانی خۆرهەڵات کرد، بەڵام لەوێ دەرفەت و مۆڵەتیان پێ نەدان. هاتە بەهدینان، لێیاندان و کوژران. چوونە ئێران، مەحکوم و دەستبەسەر کران.

واتە ئەوەی دەردەکەوێت: سەرکردایەتی یەکێتی نیشتیمانی نەیتوانی یەکێتی نێوان باکوور- باشووری کوردستان پێکبێنێت. ئەگەر شۆڕشی باکوور نەبێ ئێوە ناتوانن شتێک بکەن. هەرچی بکەن و ڕاستیش بێت، باشوور بە تەنها ناتوانێ شتێک بکات. ئێوە ئەمە لە من زۆر باشتر دەزانن. ئەمە حەقیقەتێکە پێویستە بە قووڵی و بە فرەوانی تاوتوێ بکرێ. ئەگەر شۆڕش لە باکوور یەک هەنگاو بەرەو پێش بچێت، ئەوا لە باشوور پێنج هەنگاو بەرەو پێشەوە دەچێت، ئەگەر شۆڕش لە باکوور بە سەرکەوتن بگات، باشوور دەبێت بە دەوڵەت، یاخود سەرکەوتنی یەکجارەکی بە

دەست دێنێ. ئەمانە بۆچوونی ڕاستن. ئیتر پەیوەندی و ڕێککەوتن لە کوردستاندا پەرە دەسەنێ و بەدیدێت. بێگومان هەندێ ڕەخنەش هەر دەبێ. چونکە ئەگەر ڕەخنە و گیروگرفت و ناکۆکی نەبێت، پەرەسەندنیش نابێت.

تازە بە تازە کەسایەتی مرۆڤی کورد دەخوڵقێنرێ. نەتەوایەتی و دیموکراسی کوردان تازە بە تازە ئاوا دەکرێ و بونیاد دەنرێ. ئەمانە خاڵی گرنگن. هەموو شتێک لە ڕێگای برایەتییەوە چارەسەر ناکرێت. لە بەیەکەوە ژیان و تێکۆشاندا گەلێک مەرج و شەڕیش هەیە. دەبێ باش بزانی لە کام قۆناخدا دۆستایەتی پێشدەخەیت و لە کام قۆناخدا شەڕ دەکەیت، واتە باش هەڵوەستە سەبارەت بە لایەنی ولاتپارێزی دەکەیت. هەروەها پێویستە بە چاوی "براکوژی" تەماشای مەسەلەکە نەکرێت. چونکە کێشەکە کێشەیەکی نەتەوەیی و کۆمەڵایەتییە. هەندێ جار تا دوایی ڕێککەوتن پێش دەخرێ، هەندێ جاریش ڕێککەوتن زیانت پێدەگەیەنێت. دەبێ بە گوێرەی بەرژەوەندیەکانی گەل هەڵیسەنگێنی و هەڵوێست دیار بکەیت. هەندێ جار ڕێککەوتن هەمووومان، واتە تەواوی گەلی کورد بەهێز دەکات. بەڵام ئەو ڕێککەوتنانەی بارزانی لەگەڵ دەوڵەتە جیاجیاکاندا ئەنجامی دەدات گەل دووچاری زیان و شکست دەکات. بۆ نموونە، بە ئاشکرا دەڵێ: "لە پێناو بنەماڵەکەم ئێوە بمرن". هەروەها جگە لە بنەماڵەکەی هیچ شتێکی دیکەی بە لاوە گرنگ نییە.

## یەکێک لە ئەرکەکانی کۆنگرەی نیشتیمانی
## کەمکردنەوەی جیاوازییە ئایدیۆلۆژیەکانە

پەیوەندی لەگەڵ دەوڵەتاندا پێویستە لە خزمەتی تەواوی گەلدا بێت. ئەگەر پەیوەندیت لە خزمەتی تەواوی گەل بێت ڕاستە. ئێمە لێرە نەتەوەی کورد دەخولقێنین. ئەو کاتە هەموو شتێک لە خزمەتی بەرژەوەندی گەلدا دەبێت. ئەم پەیوەندییانە تەنیا لە خزمەتی گەلی کوردیشدا نییە، پێویستە لە خزمەتی تەواوی گەلاندا بێت. ئێمەش پەیوەندی پێشدەخەین، بەڵام ئەم پەیوەندییانە دەکەوێتە خزمەتی گەلی کوردەوە، ئەمەش بە مانای سەرکەوتنی کۆنگرەی نیشتیمانی دێت. کۆنگرەی نیشتیمانی لە سەر چی دەوەستێ؟ لەسەر ستراتیژی کوردستان دەوەستێ. لەسەر مێژووی کوردستان، لەسەر مێژووی نەتەوەیی دەوەستێ. واتە لەسەر مێژووی جاشایەتی و ئاغایەتی و عەشیرەتگەریی و مەلایەتی ناوەستێ، بەڵکو لەسەر مێژووی گەل دەوەستێ و تاوتوێی دەکات. مەلا و میر و ئاغا دەرکەوتوون. بەڵام بۆچوونەکانیان زۆر داخراو و سنووردارن، هەریەکە و لە پارچە و ناوچەیەکی بەرتەسکدا دەرکەوتوون و بە قۆناخی نەتەوەیی بوون نەگەیشتوون.

گەلی کورد تازە بە تازە دەبێتە خاوەنی مێژوو. کۆنگرەی نیشتیمانی چییە؟ ئەم کۆنگرەیە بەرژەوەندییەکانی گەلی کورد دیاری دەکات و دەیپارێزێت. لە ڕابردوودا

میرنشینەکان ئاوا کراون، بەڵام مێژوومان پێکنەهاتووە. بۆچی توانای بیرکردنەوە و هزرمان سنووردارە؟ چونکە هەرکەسە و خۆی بە مەڵبەند و سەنتەری کوردستان دەبینێ. کوردستانێکی چوار پارچە و ناوەندی جیا جیای کۆسپن لە بەردەم بە نەتەوە بوون. گەل وەک ڕۆح و جەستە وایە، یەکپارچەیە. ئەم جەستەیەش پێویستی بە مێشک هەیە. ئێستا هیچ کەسێک ناتوانێ نکوڵی لە کوردان بکات، وەک گەلێک بوونی هەیە. بەڵام مێشکێک واتە ناوەندێکیان نییە کە ڕێنمایی و ئاراستەیان بکات. یاخود هەندێ منداڵی زۆر لاسار و هەرەپاسن و هەر یەکە و دەنگێکی جیاوازی لێوە دێت. ئێستا ڕەوشەکە بەمجۆرەیە. کارکردنمان لەگەڵ یەکتردا لە پێناو دامەزراندنی کۆنگرەی نیشتیمانییە. ئەمەش بۆ کوردان ڕۆڵی مێشک دەبینێ. بەرژەوەندییەکانی ئەم گەلە لە جیهاندا چییە؟ بەرژەوەندییە ناوخۆییەکان چین؟ بەرژەوەندییەکانی گەلی کورد لە جیهان و سوودی بۆ جیهان چییە؟ ئەمە پرسێکی ستراتیژییە. تەنیا لە ڕێگای دیاریکردنی ستراتیژیەت ڕوون دەبێتەوە. ستراتیژی پرسێکی نیشتیمانییە. واتە پرسی هێزێکی سەربازیی یاخود پرسێکی سیاسیش نییە. لە کۆنگرە بڕیار بدەن و بڕیار دەربخەن. مرۆڤ دەتوانێ پێی بڵێ ئەنجوومەنی کوردان یان یەکێتی نەتەوەیی کوردان؛ ئەگەر بڕیاری بچووک بێت یان مەزن دەتوانێ بڕیاری گونجاو و سەربەخۆ بستێنن. ئەو بڕیارانەی دەردەچێت، دەبێتە

بڕیاری تەواوی گەلی کوردستان. ئەوەی دژی ئەم بڕیارانە بووەستێ دوژمنی میللەتی کورد و گەلی کوردستانە. ئەوەی دۆست بێ پێویستە بەرژەوەندییەکانی نەتەوەی کورد بەبنەما بگرێ. ئەو کاتە دەردەکەوێت، کە کێ دژت دەوەستێ و کێ پشتگیریت لێدەکات. بڕیار دەردەچێ و ئەم بڕیارانەش لە بواری کرداریدا بەرجەستە دەکرێت. ئەو کاتە چاودێری ئەوە دەکرێت کە بڕیارەکان پەیڕەویان لێدەکرێت یان نا. سێ مانگ دوای بڕیار وەرگرتن بۆ جارێکی تر کۆبوونەوە ئەنجام دەدرێت.

لە کۆبوونەوەکانی کۆنگرەی نەتەوەیی- نیشتیمانی بڕیار وەردەگیرێ. کۆنگرە بۆ نەتەوەی کورد زەرورەتە. بڕیاری نەتەوەیی پێویستە، بۆ جێبەجێکردنی ئەم بڕیارانەش لە بواری کرداریدا هێزێکی سەربازی پێویستە. لێرەدا هەرکەس بڕیار دەسێنێ، نابێ کەس بڵێ: "من سەرۆکم." ئەگەر هەرکەسە و لەلای خۆیەوە بڵێ: "من سەرۆکم"، ئەوکاتە یەکێتی پێکنایەت و بۆ بڕیار وەرگرتنیش پشتگیریی پێویست بەدی نایێ، ئەوکاتە یەکێتی نەتەوەیی بەدی نایەت و جوڵانەوە بەڕێوە ناچێ. بەمجۆرەش زیان بە گەل دەگات و عەشیرەتگەریی و ناوچەگەری بەهێز دەبێت و کەسایەتی دوژمن بەهێز دەبێ، ئەمەش مانای لە دەست چوونی هەموو شتێک دێت. هەر بۆیە دەڵێم پێویستە ئەم یەکێتییە بۆ هەموو شوێن و گوندێکی کوردستان ببرێت. لە هەموو شوێنێک بڵاو بکرێتەوە. هەروەها بۆ ئەوەی هەر کەسە و

بە گوێرەی ئارەزووی خۆی هەڵسوکەوت نەکات، پێویستی بە هێزێکی سەربازی دەکات. کاتێ ئەم ڕێوشوێنانە بگیرێتە بەر ئەو کاتە تێکۆشانی نەتەوەیی بە سەرکەوتن دەگات و خەڵکی هەر چوار پارچە جێگای خۆیان تێدا دەگرن و بەمجۆرە بە یەکێتی نەتەوەیی دەگەین. بەمجۆرەش ڕێگا لە پێش ئەو کەموکورتی و خراپەکاریانە دەگیرێت کە تا ئێستا دەردەکەوتن.

مامۆستا ئێوە شارەزای ئەمجۆرە کارانەن، ئەمە داخوازی ئێوەشە، سەبارەت بەم مەسەلەیە چی دەڵێن؟

**ئیبراهیم ئەحمەد:** کۆبوونەوەیەکی بەمجۆرە، واتە کۆنگرەی نیشتیمانی، ڕاستە و زۆر گرنگە. کۆنگرەی نیشتیمانی لە پێناو نوێنەرایەتی کردنی گەلی کورد و بەرز ڕاگرتنی دەنگی و پێشخستنی پەیوەندی لەگەڵ دەرەوە و دژایەتیکردنی ئەوانەی یەکلا نەبوونەتەوە و بە دوای شتی سووک و هەرزان کەوتوونە و دژی بەرژەوەندی گەلی کوردن، زەرورەتێکە. هەروەها کۆنگرەیەکی بەمجۆرە گرنگە بۆ ئەوەی ناوبەینکاری لە نێوان پارت و ڕێکخراوە کوردییەکان بکات و بۆچوونەکانییان لە یەکتر نزیک بکاتەوە و پەیوەندییان لە نێواندا دروست بکات و کێشە و گیروگرفتەکان چارەسەر بکات. هەروەها پێویستە هەم لە دەرەوە و هەم لە ناوخۆ نوێنەرایەتی گەلی کوردستان بکەن. پێویستە ڕۆڵی ستراتیژی خۆیان بگێڕن. پێویستە بۆ کوردان ببن بە هێزێکی دەستڕۆیشتوو. ئەم بڕیارانەی لە

پێناو بەرژەوەندی گەلی کورد وەری دەگرێ، پێویستە هەم لە بواری کرداریدا پەیڕەوی لێ بکات، هەم بیپارێزێت. یەکێک لەو کەموکورتییە گرنگانەی کە بینیومە ئەوەیە، جولانەوەکانی گەلی کورد لە چلەکان بەملاوە لە دامودەزگایەکی بەمجۆرە بێبەشن. ئێستا کاتی هاتووە و پێویستە بە پەلە لەسەری بووەستین.

**عەبدوڵلا ئۆجالان:** بێگومان پێکنەهێنانی دەزگایەکی بەمجۆرە لە چلەکان بەملاوە کەموکورتییەکی مەزنی جولانەوەی نەتەوەیی- نیشتیمانی کوردە.

**ئیبراهیم ئەحمەد:** کاتێک دوژمنانی گەلی کورد لە ساڵی ١٩٣٧ لە سەعدئاباد لەگەڵ یەکتردا ڕێککەوتن و پەیمانیان بەست، ئەو کاتە پێویست بوو کوردانیش بیر لە شتێکی بەمجۆرە بکەنەوە؛ دەبووایە ڕێکخراو و جولانەوە و عەشیرەت و ڕێبەرە کوردەکان کۆببنەوە و بەرامبەر بەم ڕێککەوتنەی دوژمنان یەکێتییان لە نێوان خۆیان ئاوا کردبووایە.

**عەبدوڵلا ئۆجالان:** بەڵێ ئەمە کەموکورتییەکی مەزنە، بەڵام ئێستا دۆخەکە جیاوازترە.

**ئیبراهیم ئەحمەد:** بەڵێ پێویستە خێرا بین و پەلە بکەین.

**عەبدوڵلا ئۆجالان:** دواخستن باش نییە، چەند کەسایەتی و خاوەن عەشیرەت و پارت و ڕێکخراو هەن با هەموویان بێن. هەرچەندە ناکۆکیمان لە نێواندا هەبێ با دیسان

هەموویان بێن. تەنانەت ئەگەر یەکێک تەنیا هەست بە کوردایەتی بکات با بێت و جێگای خۆی تێدا بگرێت.

**ئیبراهیم ئەحمەد:** بێگومان منیش لەگەڵ بۆچوونەکانتان هاوڕام، بۆ پێکهێنانی کۆنگرەیەکی نەتەوەیی- نیشتیمانی پێویستە چەند کەسایەتی و حزب هەیە سەرەڕای جیاوازی و ناکۆکی نێوانیان هەموویان بێن جێگای خۆیان تێدا بگرن. هەروەها پێویستە کەسایەتییە نیشتیمانپەروەرەکانیش جێگای خۆیان تێدابگرن، نابێ هیچ کەسێک بەلاوە بنێین. ئەرکێکی ئەم کۆنگرەیەش ئەوەیە جیاوازی ئایدیۆلۆژیی داخاتە نزمترین ئاست و لە یەکتریان نزیک بکاتەوە، بیانهێنێتە لای یەکتر و چارەسەرییەک بۆ ناکۆکیەکانی نێوانیان بدۆزێتەوە.

**عەبدوڵلا ئۆجالان:** ئەگەر ئامانجی هەموان ئازادی بێت و ئەمەش تاکتیک بێت بۆ گەیشتن بە ئازادی، ئەوکاتە پێویستە تەواوی پارت و کەسایەتییە ناسراوەکان و بگرە عەشیرەتە ولاتپارێزەکانیش تەڤلی بن. پێویستە سەبارەت بە چارەنووسی خۆیان ببن بە خاوەنی بڕیار، ئەگەر ئەنجوومەنمان نەبێ، کەس نرخ و بەهامان پێنادات. ئەگەر ئەنجوومەنمان نەبێ کەس بە چاوێکی مەزن سەیرمان ناکات. ئەو کەموکورتییەش کێشەیەکی سەرەکی کوردانە، لە ڕاستیدا گەلێک کەسایەتی دەخوازن هەنگاوێکی بەمجۆرە بهاوێژرێت. بەلام هەندێکیان دەڵێن: "شەڕی نێوان PKK و بنەماڵەی بارزانی هەیە"، ئەمەش ڕاست نییە. گەلێک جار

ئاخافتم و گووتم: "ئەگەر دەخوازن شەڕە ناوخۆییەکانی نێوان کوردان کۆتایی پێبێت، ئەوا کۆنگرەی نیشتیمانی دامەزرێنن". چونکە ئەم شەڕە تەنیا شەڕی نێوان PKK و بنەماڵەی بارزانی نییە. بەڵکو شەڕی تەواوی کوردانە. شەڕی YNK شە، شەڕی باشوور وPDK ی ئێران و شەڕی باکووریشە.

با کۆنگرەی نەتەوەیی- نیشتیمانی بڕیار سەبارەت بەو مەسەلەیە وەربگرێ، ئێمەش پشتگیریی لێدەکەین. با بڕیار دەرهەق بە بارزانیش وەربگرن. با بە مەسعود بارزانی بڵێن: "لەگەڵ فاشیزمی تورک چی دەکەیت؟ ئەو پەیوەندییەی لەگەڵ فاشیزمی تورک بەستووتە لە خزمەتی گەلی کورددا نییە". با مەسعود بارزانیش ئەمە پەسەند بکات. ئەو کاتە بۆچی شەڕ نەوەستێنین! ئەگەر کۆنگرە بڕیار وەربگرێ و بڵێ: "ئاپۆ پێویستە کارەکانت بەمجۆرە بەڕێوەبچێ، شەڕ بووەستێنە و بەمجۆرە هەڵوەستە بکە"، من دەستبەجێ پەسەندی دەکەم. ئەگەر داوامان لێ بکەن خزمەتی فیدراسیۆنی باشوور بکەین، داخوازییەکی مەزنە و خزمەتی دەکەین. ئەگەر بڕیاری بەمجۆرە وەربگیرێ، ئەو کاتە ناشێ لایەنەکانی باشوور دۆستایەتی لەگەڵ تورکە فاشیستەکان بکەن.

برا پێویستی بە برا هەیە. ئایا دەشێ ژەنەراڵێکی فاشیستی تورک بەخۆی بێتە باشووری کوردستان و دژی دوژمنەکانی گەلی کورد بجەنگێ؟ مەحاڵە، چونکە ئەوان بە

خۆیان دوژمنی گەلی کوردن، دانیان بە هەبوونی گەلی کورد نەناوە، دژی کوردان دەجەنگن و شەڕێکی تایبەت پەیڕەو دەکەن. ڕێ بەوە نادەن کوردان لە ژێر کۆنترۆڵ و چاودێرییان دەربکەون. پەیوەندی بەستن لەگەڵ ئەوان دۆستایەتی نییە، بەڵکو دوژمنایەتییە. نەتەوایەتی دژی ئەمە پێکدێت و ڕێگا بە پەیوەندی بەمجۆرە نادات. لە ڕاستیدا ئەوەی لە ئارادایە شەڕی 'براکوژی' نییە، بەڵکو شەڕی کوردایەتییە دژی داگیرکاریی. ئەگەر وانەبێت یەک هەنگاو بۆ ئەوە ناهاوێژین کە شەڕی کوردان بکەین و نابێ و ناشێ زیان بە گیانی تاکە کوردێکیش بگەیەنین. بۆچی فشار ناخەنە سەر مەسعود بارزانی و ناچاری ناکەن تەڤلی کۆنگرەی نەتەوەیی- نیشتیمانی ببێ؟ ناخوازێ کۆنگرەی نەتەوەیی ئاوا بێ، ناخوازێ فیدراسیۆنی کوردان ئاوا بێ. جگە لە بنەماڵەکەی بیر لە هیچی تر ناکاتەوە. تەنیا بە دوای بەرژەوەندییەکانی تیرەگەریی کەوتووە. چەمکی تیرەگەرێتی تۆ بۆ دوو هەزار، سێ هەزار ساڵ بەر لە ئێستا دەگەڕێتەوە.

پێویستە ئەم کارە بە سەرکەوتن بگات. لەبەر خاتری مەسعود بارزانی ناتوانین سی-چل ملیۆن کورد بکەینە قوربانی. ئایا دەشێ لە پێناو چارەنووسی سی-چل ملیۆن کەس نەگەین بە بڕیار؟ ئەگەر بڕیار وەرنەگیرێ مەسعود بارزانی بەرامبەر بەو دۆخە بەرپرسیارە، وەستانی شەڕیش وابەستەی ئەمەیە. دەمەوێ تەواوی کوردان بەشداری تێدا

بکەن. پێشتر بە کەمال بورقایم گووت؛ "ئەگەر دەتەوێ شەڕ بووەستێ، ئەوا لە ڕێگەی کۆنگرەی نەتەوەییەوە دەبێت". کۆنگرەی نەتەوەیی- نیشتیمانی ئاوا بکەن، ماوەی دوو ڕۆژی پێناچێ شەڕ دەوەستێنم. کۆنگرەی نەتەوەیی کورد چ بڕیارێک سەبارەت بەم مەسەلەیە وەربگرێ ئامادەم. چی سەبارەت بە بارزانی و تاڵەبانیش بڵی، دەبێ هەموویان ئامادە بن. کێ ئامادە نییە؟ ئەوەی پەسەندی نەکات دوژمنی ئیرادەی گەلی کوردە. کەس ناتوانێ نکوڵی لە ئیرادەی گەلی کورد بکات. کێ لە خەباتی کۆنگرەی نەتەوەیی و بڕیارەکانی ڕادەکات و خۆی دەدزێتەوە؟ کێ خۆی لە یەکێتی کوردان دەدزێتەوە؟ ئەگەر گوێ بە بڕیاری کوردان بدرێت، تا دواڕادە دەرفەتی ئاواکردنی پەرلەمان و فیدراسیۆن لە ئارادایە. ئەمانە پێداویستیەکی بە پەلەن و تەواو کاتی هاتووە.

**ئیبراهیم ئەحمەد:** لە ساڵی ١٩٩٢ من و هاوڕێ هاوار گفتوگۆمان کرد و لە نێوان خۆمان گووتمان؛ "پێویستە کۆنگرەی نیشتیمانی دامەزرێ". هەروەها گووتمان؛ پێویستە پارت و کەسایەتییە کوردەکان بێنە لای یەکتری و یەکێتی لە نێوان خۆیان ئاوا بکەن. هەر لە ساڵی ١٩٩٢ لە ڕێی مام جەلالەوە بە بۆچوونەکانی ئاپۆی برام زانی، ئەو کاتە پرسیارم لە مام جەلال کرد "بۆچوونێکی بەمجۆرەمان هەیە، ئایا PKK تەقلی بڕیارەکەمان دەبێ؟ یان ڕەتی دەکاتەوە؟". مام جەلال پێی گووتین؛ "لەسەدا سەد تەقلی دەبێت، ئەم

بڕیاره بڕیاری خودیPKK شه، ئەگەر ئێمەش کارێکی بەمجۆره نەکەین، ئەوا PKK ئەنجامی دەدات". هەروەکو دەبینم PKK له ئێمه به پەرۆشتره و زیاتر له پێناو ئەوەدا هەوڵ و خەبات دەکات. ئەمه کارێکی گرنگ و به پەلەیە. ئێستا له قۆناخێک داین ئەگەر کۆنگرەی نیشتیمانی نەبێت نابێت. لەو بارەیەوه هیوای سەرکەوتن بۆ هەوڵ و کۆششەکانی پەکەکه دەخوازم.

**عەبدوڵلا ئۆجالان:** پێشتر باش نەبوو، بەڵام ئێستا هەلومەرجەکانی جیهانیش لەباره، وانییه مامۆستا ئیبراهیم.

**ئیبراهیم ئەحمەد:** بێگومان پێشتر هەلومەرجەکانی جیهان له بار نەبوو، بەڵام ئێستا زۆر گونجاوه، ئەگەر ئەم هەنگاوه نەهاوێژین ئەوا بەرامبەر به گەلی کورد تاوانبار دەبین.

**عەبدوڵلا ئۆجالان:** هەم هەلومەرجەکانی ناوخۆی کوردستان و هەم هەلومەرجەکانی جیهان ناچاری هەنگاوێکی بەمجۆرەمان دەکات. ئەگەر ئەم هەنگاوه نەهاوێژین دەبێته کەموکورتییەکی مەزن. له ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا به هەزاران ڕۆشنبیر و ئەکادیمی و وڵاتپارێزی کورد بەگشتی له پێناو هەنگاوێکی بەمجۆره کەوتوونەته نێو هەوڵ و جموجۆڵەوه. ئێستا کاتی خۆیەتی و بۆچی دوای بخەین؟ بۆچوونەکانتان له جێی خۆیدا دەبینین و ئێمەش هەمان بۆچوونمان هەیە، مامۆستا دەڵێ: "له چلەکان بەولاوه دەبووایه هەنگاوێکی بەمجۆره بهاوێژرابووایە". ئەگەر جوڵانەوەی کورد له چلەکان بەولاوه سەرکەوتنی بەدەست نەهێنابێ،

هۆکارەکەی بۆ دەرنەکەوتنی ستراتیژییەک دەگەڕێتەوە. هەر کەس باسی تاکتیکی کرد و لە تاکتیکیشدا کەوتنە نێو لادان و لەڕێ دەرکەوتن، بۆچی؟ چونکە تاکتیک بە گوێرەی ستراتیژ نەبوو. کاتێ ستراتیژی نەبوو، ئیتر دوژمنایەتی و پارچە بوون بەهێز بوو، لە ئاکامدا بە ڕەوشی ئەمڕۆ گەیشتین.
جولانەوەی باشووری کوردستان دەخوازێ هەنگاو بهاوێژێ. لە باکووریش لە بیستەکان بە سەرهەڵدانی کۆچگری دەستپێکرد و تا چلەکان خواستیان هەنگاو بهاوێژن، بەلام ئەوانە هەنگاوی کلاسیکی بوون. هەروەکو چۆن تەواوی جولانەوە کلاسیکیەکان شکستیان هێنا ئەوانیش شکستیان خوارد. دوای سالانی ١٩٧٥کان لە خۆرهەلاتی کوردستان ویستیان هەنگاو بهاوێژن، سەری نەگرت. خەبات و تێکۆشان بەناوی PDK پەرەی پێدرا، مامۆستا یەکەمین سکرتێریان بوو، داخوازییەکەی پێکهاتەیەک بوو کە نیشتیمانپەروەری و دیموکراسی و تەنانەت مرۆڤایەتیش بە بنەما بگرێت. بەلام لە ئەنجامی ئەم بۆچوونە سەرەتایی و پاشکەوتووانەی لە کەسایەتی مەلا مستەفا دا بەرجەستە ببوو، ئەم دەرفەتانە بە سەرکەوتن نەگەیشتن، لەگەڵ گەیشتن بە سالی ١٩٧٥ بە دواوە سەرەڕای ئەوەی بە سەدان هەزار پێشمەرگە و بە ملیۆنان دۆلار و سەدان هەزار چەک هەبوو، بەلام تەنیا لە بەر

ئەوەی داخوازی شای ئێران بوو، مەلا مستەفا بە دەستی خۆی، خۆی و جولانەوەی گەلی کوردی لە ناو برد.
دوای ئەوە YNK دامەزرا، هەرچەندە هەلومەرجەکان زۆر سەخت و دەرفەتیشیان سنوردار بوو، بەڵام ویستیان شتێک بکەن. لە لایەک ڕژێمی ئێراق بە سەرۆکایەتی سەددام بەهێز دەبوو، لە لایەکی تریش ڕژێمی ئێران دەرفەتی نەدا. خواستیان لە هەکارییەوە تێپەڕن و بچنە بەهدینان دەست بە تێکۆشان بکەن، بەڵام (عەلی عەسکەری) و هاوڕێکانی لەلایەن PDK وە شەهید دەکرێن؛ ئەوان شەهیدی کوردستانن. ئەوەی ئەم شەڕەی دواییشی هەڵگیرساند و بەڕێوەی دەبات دیسان (سامی عەبدولرەحمان)ە؛ ئەوەی لە ساڵی ١٩٧٨ هێنایە سەر شەهید (عەلی عەسکەری) و هەڤاڵانی، ئەمڕۆ دەیەوێ ئێمەش دووچاری هەمان چارەنووس بکات. دەخوازێ ئێمەش لە هەکاری بخنکێنێ. بەڵام تا ئێستاش ئەم شەڕ و تێکۆشانە بەردەوامە، ئەمە شەڕێکی نێوان دوو پارت نییە، بەڵکو تەواو شەڕێکی کوردستانییە. ئێوە زۆر باش عەلی عەسکەری و هاوڕێکانیت دەناسی، ئەوان نیشتیمانپەروەرەکان بوون، قیادەی موەقەتەی سەر بە بنەماڵەی مەلا مستەفا و هەلیکۆپتەرەکانی سوپای تورکیا چوار دەوریان گرتن و لەناویان بردن. ئەمەی ئەوان کردیان شەڕی "براکوژی" نییە، بەڵکو شەڕێکی خیانەتکارانەیە. واتە لە لایەک بزووتنەوەیەکی نیشتیمانی و

دیموکراسی هەیە کە دەیەوێ شتێک بکات، لە لایەکەی تریش بنەماڵەی مەلا مستەفا هەیە کە ڕێگەی پێنادات و دوژمنایەتی دەکات. هەربۆیە ناکرێ ئەمە بە "براکوژی" ناو بنرێ. شەڕی نێوان ئێمە و پەدەکە/ئێراقیش شەڕی "براکوژی" نییە.

ئەمڕۆ لە دەرەوە و ناوخۆی کوردستانیش دەرفەتی ئەوە زیاتر بووە کە فیدراسیۆنێک لە کوردستان ئاوا بکرێت، زەمینە و هەل و دەرفەتی لەبار ڕەخساوە بۆ ئەوەی لە تەواوی پارچەکانی کوردستان هەنگاوی مێژوویی بهاوێژێ، هیچ شتێک وەک ڕابردوو نییە. ئەم شۆڕشەی لە باکوور پەرەمان پێداوە هەل و دەرفەتێکی مەزنە. بەڵام مەسعود بارزانی دەڵێ: "با فیدراسیۆنێکی دیموکراسی بەدی نەیەت و هەرکەس لە خزمەتی بەرژەوەندییەکانماندا بێت". دەوڵەتی تورکیاش هەمان شتی دەوێ، بۆیە دەڵێن: "با فیدراسیۆنێکی گەل لە باشوور پێک نەیەت و لە ڕێگەی بەستنی ڕێککەوتن لەگەڵ PKK شۆڕش پێش نەخەن". بارزانیش دەڵێ: "تەواو باشە". لەم دواییەدا هەواڵی ئەوەمان پێگەیشت کە مەسعود بارزانی چەکێکی زۆری لە تورکیا وەرگرتووە، لەو سۆنگەیەوە ئەمە شەڕێکی دژی کوردان نییە، بەڵکو شەڕێکە دژی فاشیزمی تورکە. لایەنێکی شەڕ فاشیزمی تورک و مەسعود بارزانییە، لایەنەکەی تریش وڵاتپارێز و نیشتیمانپەروەرەکانی کوردن.

تەنیا بۆ وەستاندنی ئەم شەڕە نا، بەڵکو لە پێناو چارەسەرکردنی تەواوی گرفت و کێشەکانی گەلی کورد

پێویسته هەنگاوێکی بەمجۆره بهاوێژرێ. هەنگاوێکی بەمجۆره هەنگاوێکی نەتەوەییە و له سەرووی پارتەکانەوەیە، واته له سەرووی ستراتیژی هەموو پارتەکانەوەیە. هەنگاوی کۆنگرەی نەتەوەیی- نیشتیمانی به واتای هەنگاوی ستراتیژی نیشتیمانی دێت. تا ڕۆژگاری ئەمڕۆمان گەلێک جار تاکه پارتێک به تەنیا ماوەتەوه و زیانی بەرکەوتووه. ئەگەر بێتو جێگای خۆیان له نێو یەکێتییەکدا نەگرن کۆتاییان پێدێت و له نێو دەچن. ئەگەر بێتو مەسعود بارزانیش جێگای خۆی له نێو کۆنگرەی نیشتیمانیدا نەگرێت، زیانێکی زۆری بەردەکەوێت. بۆ هەنگاونانێکی بەمجۆره کات زۆر لەبار و گونجاوه. هەر له ئێستاوه سێ چوار دەوڵەت ئەمه پەسەند دەکەن. گەلی کورد به پەله پێویستی به قەواره و پێکهاتەیەکی بەمجۆره هەیە. له ڕێگای شۆڕشەوه گەلی کورد هەڵساوەتەوه سەرپێیان، به ملیۆنان ڕۆڵەی گەلی کورد ئامادەن دەنگی خۆیان بدەنه پاڵ کۆنگرەی نیشتیمانی. هەربۆیە کەس ناتوانێ بڵێ هەلومەرج لەبار و گونجاو نییه و نابێ.

ئەم لۆژیکه ڕاست نییه که دەڵێ: "شەڕ بووەستێنن، ئاشت بنەوه، پاشان کۆنگره دابمەزرێنن". هەرچەنده کێشه و کۆسپ و ناکۆکی هەبێت، بەڵام هەمووی له ڕێی کۆنگرەی نەتەوەییەوه چارەسەر دەکرێت. کۆنگرەی نەتەوەیی- نیشتیمانی بۆ چارەسەرکردنی ئەمجۆره کێشانەیە. منیش تەقڵی بانگەوازیەکەی مامۆستا دەبم. ڕەنجێکی زۆری له پێناو کوردایەتی داوه. ئێستا هاتینه لای یەکتری، ئەم

یەکێتییەمان هەنگاوێکی گرنگە بۆ گەلی کورد، لەو باوەڕەدام کە لە سەر ئەم بنەمایەش کۆنگرەی نیشتیمانی دادەمەزرێنین. لە ئەنجامدا جێگای هەمووومان کۆنگرەی نیشتیمانییە.
زۆر بە هاتنی مامۆستا دڵخۆش بووین، مامۆستا وەک گەنجێکی ١٨ ساڵی وایە، ئەم دڵخۆشییە لە مامۆستا هاواریشدا دەبینم، ئەمەش ڕۆحێکی نەتەوەییە، ڕۆحێکی شۆڕشگێڕییە.
**محەمەد ڕەسوڵ هاوار:** سەرۆکی بەڕێزم هەندێ کەس ڕەخنەی ئەوەتان لێ دەکات کە پارتەکەتان خاوەن ڕێبازێکی مارکسییە، ئەم ڕەخنەیەش هەم لە لایەنی ئەم دەوڵەتانەوە دەکرێ کە بەرژەوەندییان لە ناوچەکەدا هەیە و هەم لە لایەنی هێزی تریشەوە، هەڵوێست و وەڵامتان بەرامبەر بەم ڕەخنانە چییە و چۆنە؟
**عەبدوڵلا ئۆجالان:** ئەو مارکسیەتەی لە PKK دا بەرجەستە بووە زانستە. لەسەر بنەمای پشتبەستن بە سۆسیالیزمی سۆڤیەت پێشنەکەوت. سۆسیالیزمی ئێمە سۆسیالیزمێکی زانستییە. چی لەم سۆسیالیزمە تێدەگەین؟ لە ڕێگای ئەم سۆسیالیزمەوە چۆن بەشێوەیەکی زانستی کۆمەڵگە دەناسرێ و پێناسە دەکرێ؟ زانست لە بارەی کۆمەڵگەوە چی دەڵێ؟ ئەمەمان بە گوێرەی ڕەوش و تایبەتمەندیی کوردستان بەرجەستە و پەیڕەوکرد. بەمجۆرە بە شێوەیەکی زانستی هەڵوەستەمان سەبارەت بە مێژوو و شۆڕشی کوردستان کرد و لەسەری ڕاوەستاین. ئەمەیە

چەمکی سۆسیالیستیمان. چەمکی سۆسیالیستیمان هەر لە سەرەتاوە تا دوایی زانستییە. ئەگەر دیدگا و بۆچوونێکی زانستیمان نەبووایە، مەحاڵ بوو مێژوو بناسین و کۆمەڵگە شیبکەینەوە و پەرەسەندنێک بە دەست بێنین. سۆسیالیزمی زانستی ڕۆشنی کردینەوە، ڕێگای نیشاندایین، پێی گووتین بەمجۆرە مێژووی خۆتان دەناسن و بەمجۆرە پێشدەکەون. هەندێ کەس سەبارەت بە ئێمە دەڵێن: پەکەکە مارکسی-لینینییە، تەنانەت دەڵێن: ستالینی و ماوین، یاخود دەڵێن: ئاپۆیستن. هەرچییەکی دەگوترێت با بگووترێ، لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا گرنگ ئەوەیە ئەگەر زانست نەبێ هیچ شتێک ناناسرێ. ئەمڕۆ هەموو شتێک بە شێوەیەکی زانستی لە نێو کۆمەڵگە بەڕێوە دەبەین و بەم شێوەیە گەشە دەستێنین. ئەگەر سیاسەتێکی زانستیانە نەبێت ناشێ لە کوردستاندا پەرەسەندن و پێشکەوتن بەدیبهێنرێ، بە تایبەتیش لە هەلومەرجی ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا ئەستەمە. ئەو تێکۆشانەی ئەمڕۆ بەڕێوەی دەبەین لە ژێر ڕۆشنایی سۆسیالیزمی زانستی بەڕێوەدەچێ. هەر لەم چوار چێوەیەشدا کەسایەتی و کۆمەڵگەی کوردمان شیکردەوە و هەڵمانسەنگاند و بەشێوەیەکی زانستیانە تێڕوانینمان سەبارەت بە کورد و کوردستان گۆڕی. وەک بەرهەمێکی ئەم شیکردنەوە و هەڵسەنگاندنانە PKK پێکهات. بۆچوونی PKKتێڕوانینێکی ڕاست و زانستییە. بۆچی ڕاستە؟ چونکە زانستییە. چۆن دەتوانین نکوڵی لە زانست بکەین؟ ئەگەر نکوڵی لە زانست بکەین ئەو کاتە ناشێ بە سەرکەوتن

بگەین. هەر بۆیە ئەوەمان لا گرنگ نییە کە ئەو دەوڵەتە چی گووتووە، ئەو دەوڵەتە چی دەڵێ.

جاران پارتی کۆمۆنیستی تورکیا پێی دەگووتین؛ "نەتەوەپەرستی کوردن". چەند دەوڵەتێکی ئەوروپاش دەیانگووت؛ "کۆمۆنیستی ئۆرتۆدۆکسن". هەندێکیشیان دەیانگوت؛ "ئایینگەران"، هەرکەسە و شتێک دەڵێ. ئەمڕۆ بە شێوەیەکی زۆر ڕوون و ئاشکرا دەرکەوتووە کە ئەمانە هیچ گرنگییەکیان نەبووە. ئێمە هیچ کاتێک لەسەر بنەمای پشتبەستن بەم تێڕوانینانە و کاریگەریەکانیان چالاکی و کار و خەباتمان بەڕێوەنەبرد. ئەو تێکۆشان و خەباتە شۆڕشگێڕییەی هەر لە سەرەتاوە تا ڕۆژگاری ئەمڕۆ پەیڕەومان کردووە، خەباتێکی زانستییە. هەم زانستین و هەم نیشتیمانی. چونکە هەلومەرج و دۆخی کوردستان پێویستی بەمە هەیە.

تا کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی و کۆمەڵگەی کوردستان هەبێ بە شێوەیەکی زانستی پرس و کێشەکان تاوتوێ دەکەین. لە هەلومەرجەکانی ڕۆژگاری ئەمڕۆدا زانست بەرکارە و ئەمەش مافێکی ئێمەیە. بێگومان ئەگەر زانست نەبێ ناشێ هیچ شتێک ئەنجام بدرێ، ناتوانی شۆڕشی کوردستان ئەنجام بدەی. ئێمە بەوە دەڵێین: سۆسیالیزمی زانستی. هیچ چارەیەکی تریشمان نییە.

## کۆنگرەی نیشتیمانی
## لە پێناو گەیشتن بە ستراتیژیەتی کوردان

**محەمەد ڕەسوڵ هاوار:** هەروەکو دەزانرێ پەرلەمان نوێنەرایەتی گەلێک دەکات، لە ڕێگای دەنگدان لەلایەن گەلەوە هەڵدەبژێردرێن و لە ڕێگای ئیرادەی گەل و بە شێوازێکی دیموکراسییانە دەبنە پەرلەمانتار. "پەرلەمانی کوردستان لە دەرەوەی وڵات" ئێستا لە هەندەرانە، لە ئەنجامی هەندێ هۆکاری تایبەت ئەندامەکانی لە ژێر هەلومەرجێکی زەحمەتدا هەڵبژێردران. ئایا ئەندامانی پەرلەمانی کوردستان لە هەندەران دەتوانن بە تەواوەتی ئەرکەکانیان جێبەجێ بکەن؟ ئایا دەتوانن دەنگ و ڕاستینەی کوردان بگەیەننە ڕای گشتی گۆڕەپانی نێودەوڵەتی؟ وەک دەزگایەکی هاوتەریبی ئەوە بیر لەوە دەکرێتەوە کۆنگرەیەکی نیشتیمانی وەک پەرلەمانێکی نیشتیمانی دابمەزرێندرێ. هەر بۆیە کەسایەتی هەر چوار پارچەی کوردستان جێگای خۆیان تێدا دەگرن. ئایا ئەم کۆنگرەیە جێگای پەرلەمانی دەرەوەی وڵات دەگرێتەوە؟ چەندە دەتوانێ ڕۆڵی خۆی ببینێ؟ ئایا بۆچوونتان سەبارەت بە کۆنگرە چییە؟ تا چ ڕادەیەک پارتیتان پشتگیریی لە کۆنگرەی نەتەوەیی دەکات؟

**عەبدوڵلا ئۆجالان:** کۆنگرەی نەتەوەیی- نیشتیمانی کوردان بۆچی؟ چونکە هێشتا گەلی کورد نەبۆتە خاوەن بڕیار، گەلێک خاوەنی بڕیار نەبێ، گەلێکە لە هزر و مێشک بێ بەشە. ناکرێ و ناشێ گەلێک بێ مێشک بێت، لە سەدەی بیستەمدا ئەو مێشکەی کە هەشبوو بڵاوەی پێکرا، کوردستان پارچەکراوە، لەبەر ئەوەی دوژمنان دەسەڵات و ئیرادەی خۆیان لە هەر پارچەیەکدا زاڵ کرد، شتێک لە ئارادا نەما کە ناوی مێشکی کوردان بێت. ئیتر مێشک تا دواڕادە بچووک کرایەوە و گەلی کورد بەبێ ڕێبەر و بێ مێشک مایەوە. لە پێناو بینینی ڕۆڵی مێشکی کوردان، کۆنگرەی نیشتیمانی پێویستییەکی بە پەلەیە. گەلی کورد دەست و پێ و چاو و گوێی هەیە، بەڵام مێشکی نییە. هەرگیز ناشێ ٣٠-٤٠ ملیۆن مرۆڤ بەبێ مێشک بمێنێ. مێشک هزرکردنە، بڕیار و کۆنترۆڵە. بەڵێ مێشکێکی بەمجۆرە بۆ گەلی کوردیش پێویستە کە بیردەکاتەوە، بڕیار دەدات و بڕیارەکانیشی جێبەجێ دەکات. لە ساڵانی چل و پەنجاکان بە دواوە ئەنجوومەنێک و مێشکێک بۆ میللەتی کورد پێک نەهێنرا. پێویستییەکی سەردەمی بوو، بەڵام سەرەڕای ئەوەش پێکنەهات. ئەگەربهاتبووایە مێشکێکی بەمجۆرە پێکبەهاتبووایە، ئەمڕۆ کوردستان لە نێو هەلومەرجێکی زۆر جیاوازدا دەبوو.

وەک دەبینرێ ئێستا کوردستان خاوەنی ستراتیژیەتێکی گشتی نییە. ستراتیژ چییە؟ هزر و بیرکردنەوەیەکی قووڵ و

بەرفراوانە، بوونە بە خاوەنی بڕیار. ئێستا ئەمە لە ئارادا نییە و هەر کەسە و لە شوێنی خۆی خاوەنی بڕیارێکە. لەو شوێنەی هەرکەسە و لە خۆیەوە بڕیارێک بدات شۆڕش ناکرێ و ئەم گەلەش لە ژێر دەستی داگیرکەران ڕزگاری نابێت. هەنگاوی سەرەکی چییە؟ کێیە ئەوەی کە گوێڕایەڵی بڕیارەکان دەبێ و کێیە گوێڕایەڵ نابێ و پەیڕەوی ناکات، با کۆنترۆڵی بکەن. ئیتر پێویستە هەر کەس حیساب و لێکدانەوەکانی بە باشی بکات، ئیتر کێ بە باشی گوێڕایەڵی بڕیارەکان بکات و کێ گوێڕایەڵی نەکات ئەو بە خۆی دەزانێ.

خاڵێکی تریش ئەوەیە؛ جاران هەلومەرجەکان بەرتەسک و سنوردار بوون، دەرفەت و تواناکانیش لە بار نەبوون. هەلی ئەوە نەبوو چەند مرۆڤێکی کورد بێنە لای یەکتری. بەڵام ئەمڕۆ هەلومەرجی کوردستان و دەوڵەتانیش لەبار و گونجاوە. ئەمە داخوازی و مەیلی میللەتی کوردە. ئیتر سەردەم سەردەمی کۆنگرەی نیشتیمانییە. درەنگخستن راست و لە جێگای خۆیدا نییە. ئیتر تەواوی پارچەکانی کوردستان لەگەڵ یەکتر لە ناو پەیوەندی دان. شۆڕشی پارچەیەک کاریگەری بەسەر پارچەکانی تر دەکات، بڕیاری پارچەیەک کاریگەری لەسەر پارچەکانی تر دەکات. پەیوەندییەکانی پارتێک، پارتەکانی تری کوردستان و پارچەکانی تر پەیوەندیدار دەکات. ئیتر یەکێتی کوردان

گەورەترین دەرفەتە بۆ گەیشتن بە سەرکەوتن. چونکە یەکێتی نەتەوەیی نەبێ سەرکەوتنیش نابێ.
لەبەر ئەم هۆکارانەش کۆنگرەی نەتەوەیی - نیشتیمانی بەر لە هەموو شتێکەوەیە، خەباتێکە دەکەوێتە سەرووی کار و خەباتی هەر پارتێکەوە. ئەگەر دەمانەوێ کێشەکان چارەسەر بکەین، ببین بە یەک و دەوڵەت و ستاتۆیەک دابمەزرێنین و بە ئازادی بگەین، ئەوا بەر لە هەموو شتێک پێویستە کوردان بە بڕیارێک بگەن، ئەمەش لە ڕێگای کۆنگرەیەکی نەتەوەییەوە بەدیدێت. ئیتر پێویستە خۆمان بە ستراتیژیەتێکی گشتی بگەیەنین. بۆ گەیشتن بە ستراتیژیەتیش کۆنگرەی نیشتیمانی پێویستی قۆناخەکەیە. ئەو پەرلەمانەی لە دەرەوەی وڵات دامەزراوە هەنگاوی یەکەمە. کۆنگرەی نەتەوەیی- نیشتیمانی پەرلەمانی دەرەوەی وڵات تەواو دەکات. ئەگەر کۆنگرە پێک بێت، لەو بڕوایەدام کە ئەندامانی پەرلەمانی دەرەوەی وڵاتیش دەبنە ئەندامی کۆنگرە. پەرلەمانی دەرەوە زەمینەیەکی باشە بۆ کۆنگرەی نیشتیمانی و یەکتری تەواو دەکەن.

## سەرەتا پرسی نەتەوەیی کورد، دواتر زمان

**محەمەد ڕەسول هاوار:** سالآنێکە گەلی کورد لە ژێر فشار و ئێش و ئازار و ئەشکەنجەکانی دەستی داگیرکەری تورک دەنالێنێ، دۆخێکە تا بلێی خراپە. لە ئەنجامی بێدەنگی جیهانی دەرەوە بەرامبەر بەم تاوانانە و گرنگی دانیان بە پەیوەندییەکانیان لەگەڵ تورکیا، گەلی کورد لە زمانی دایک بێبەش بووە، ٧٥ ساڵە لە مافەکانی خۆی بێبەش بووە، لە پێشخستنی زمان و کولتور و ڕاگەیاندن و بلاو کردنەوە و تەواوی مافەکانی تریش بێبەش بووە. بە بڕوای من بۆ پێشخستنی کولتوری گەلەکەمان، مرۆڤ دەتوانێ لە کوردەکانی دەرەوەی ولات دەست بە خەباتێک بکات، چونکە ئەمەش ڕاستییەکە کە ئەوانیش لە قسەکردن بە زمانی دایک زەحمەتی دەبینن. بە بۆچوونی ئێوە بۆ ئەنجامدانی ئەم کار و خەباتانەی باسمان کرد، چۆن دەتوانین ئەم کۆسپ و ئاستەنگانەی هەن بەلاوە بنێین؟

**عەبدوڵلا ئۆجالان:** پرسی زمان و کولتوری کوردان گرێدراوی پرسی نەتەوەیی گەلی کوردە. بە شێوەیەکی گشتی بەبێ ئەوەی پرسی نەتەوەیی کورد بە چارەسەری بگات یان پەرە بسەنێ، پەرەپێدان و پێشخستنی زمان و کولتوری کوردی زەحمەتە. لە ڕێگای ئەکادیمیاکانەوە دەکرێ هەندێ هەنگاو لە پێناوی زمانی کوردی بهاویشترێ، بەلآم ئەمەش نابێتە مولکی گەل. شانبەشانی ئەمەش پێویستە شۆڕش و دەسکەوتی سیاسی لە ئارادا بێ. تا ئێستا زۆر هەڵوەستە سەبارەت بە پرسی زمان

کراوە، بەڵام کاریگەریەکەی زۆر نەبووە، چونکە پرسە سیاسییەکانی چارەسەر نەکراوە. ئەگەر پرسە سیاسیەکان چارەسەر نەکرێن، منداڵانی کورد ناتوانن بچنە قوتابخانە و قوتابخانەکان ناکرێنەوە. کاتێک پرسی نەتەوەیی بە چارەسەری بگات، ئەو کاتە پرسە سیاسیەکانیش چارەسەر دەبن و منداڵانیش دەچنە قوتابخانە و مامۆستا زۆر دەبن و پرسی زمان چارەسەر دەبێت، بەمجۆرەش پەرەسەندن و پێشکەوتن بە خۆیەوە دەبینێ.

ئەگەر پرسە سیاسیەکان چارەسەر نەکرێن، چۆن پرسە کۆمەڵایەتییەکان و پرسی زمان چارەسەر دەکرێت؟ قوتابخانەکان لە کوێ ئاوا دەکرێن؟ تەنانەت دەرفەتی نییە قوتابخانە لە دەوڵەتە ئەوروپییەکانیش دامەزرێنرێ؟ هەر بۆیە گەڕان بە دوای چارەسەری پرسی زمان تەنیا لە دەرەوە ڕاست و لە جێگای خۆیدا نییە. لە ڕۆژی ئەمڕۆماندا پرسی زمان پەرەسەندنێکی مەزن بە خۆیەوە دەبینێ، چونکە شۆڕش مەزن دەبێ و پێشدەکەوێ. لێرەدا ئەوەی پێویستە ئاگاداری بین ئەوەیە؛ کە نابێ بابەتی زمان بخەینە سەرووی پرسی نەتەوەیی، هەروەها بابەتی زمان پرسێکی وانییە کە لە ڕۆژێکدا چارەسەر بێت، بابەتێکە ماوەیەکی درێژ دەخایەنێ. هەروەها پرسی زمان ناکرێ لە دەرەوەی پرسی سیاسی بێ، لە دەرەوەی ئەویش چارەسەر نابێ. ئەوەش ماوەیەکی زۆری دەوێ.

تەنیا پرسە سیاسیەکان لە پێش ئەم مەسەلەیە کۆسپ نین، بەڵکو کێشەی تایبەتیش هەن. لەو ڕەوشەی لە ئارادایە

زمانی کوردی بۆ چوار زار و چەندین شێوەزار پارچە کراوە، تەنانەت هەر زاراوەیەکیش لە ناو خۆیدا بە گوێرەی ناوچەکان دیالەکتی جیاوازیان هەیە. هەروەها کاریگەری زمانی تورکی و عەرەبی و فارسیش بە سەر زمانی کوردییەوە هەیە. لە لایەکی تریش نەتەوەی کورد پەیوەندی لەگەڵ یەک زمان پێشنەخستووە، بەڵکو پەیوەندی لەگەڵ زمانی عەرەبی و تورکی و فارسی پێشخستووە. بۆ نموونە، کاریگەری ئەم دۆخەش زۆر بەسەر ڕۆشنبیرانەوە دیارە. ئەمەش زەحمەتیەکی زۆر بۆ پرسی زمان دروست دەکات. هەروەکو چۆن کلیلی هەموو شتێک شۆڕشە، کلیلی زمان و کولتوریش شۆڕشە. لەگەڵ سەرکەوتنی شۆڕش پرسی زمانیش چارەسەر دەبێ.

هەر لە ئێستاوە خەریکە هەندێ دەرفەت دەڕەخسێ. تەلەفزیۆن، ڕادیۆ و ڕۆژنامە هەنگاوی مەزنن بۆ گەشەپێدانی زمانی کوردی. لە داهاتوو ناوچەی ڕزگارکراو هەبێ، دەکرێ لەوێ ئەکادیمیای زمانی کوردی بکرێتەوە. گەلێک زاراوەی جیاجیا هەیە، هەرچەندە گەل لەگەڵ شۆڕش ئاوێتە بێ و مرۆڤەکان یەکبگرن، ئەوا زاراوەکانیش لە یەکتری نزیک دەبنەوە و زمانێکی نەتەوەیی پێکدێت؛ لێرەدا ئاوێتەبوون و بەناویەکداچوونی زاراوەکان بابەتی باسە. بێگومان ئەمەش پێویستی بە کات هەیە، بەڵام هەر لە ئێستاوە پێویستە تەلەفزیۆن و ڕادیۆ و ڕۆژنامەکان بەشێوەیەکی تایبەت گرنگی بە زمانی کوردی بدەن.

## دیکتاتۆرییەت و خۆسەپاندن
## بانگەشەی گێل و نەفامەکانە

**محەمەد ڕەسوڵ هاوار:** دوژمنانی پارتەکەتان دوژمنانی نەتەوەی کوردیشن. هەروەها ئەو بڕیارانەی پارتیتان پێیەوە گرێدراوە، گەلی کوردیش پێیەوە گرێدراوە. ئەم بڕیارانە هەمووی لە ژێر سەرۆکایەتی ئێوەدا دەردەچێت. کاتێ ئەم بڕیارانە دەردەخەن لەگەڵ هەموو هەڤالانتدا دادانیشیت و گفتوگۆی لەسەر ناکەیت، دوژمنەکانتان ئەمە وەک خاڵێک بۆ خۆیان دەقۆزنەوە، ئەو پڕووپاگەندەیەی لە نێو گەلدا دەیکەن بەمجۆرەیە، دەڵێن: دیموکراسی لە ناو PKKدا نییە و دیکتاتۆرییەت هەیە. بۆچوونتان سەبارەت بەم مەسەلەیە چییە؟

**عەبدوڵلا ئۆجالان:** شێوازی ڕێبەرایەتی شێوازی ڕێگەچارەی دیموکراتیانەیە. کار و خەباتی ڕێبەرایەتی خەبات و داخوازی گەلە، خەباتێکی مێشک و زمانی گەلە، ئەوانەی بانگەشەی بەمجۆرە دەکەن، گێلێکی زەبەلاحن. تەنانەت من بەوانە دەڵێم: "نەفام و گێلێکن کە گوێیان دوو سێ بست درێژە". بەر لە رابوونی ئێمە و لەدایکبوونی PKKکەس نەیدەتوانی بڵێ من کوردم، لەوە دەترسا وەک کوردێک بیربکاتەوە و بە کوردی گۆرانی بڵێ، هیچ کۆبوونەوەیەکیان لەم پێناوەدا بۆ ئەنجام نەدەدرا. ئەمڕۆ بە ملیۆنان کورد لەگەڵ شۆڕش بەڕێوەدەچێ. چ لە ناوەوەی

وڵات بێ یان لە دەرەوە بە سەدان هەزار مرۆڤ لەسەر پێیانن. لە ڕابردوو لە کاتێکدا ژنانی کورد نەیاندەتوانی یەک هەنگاو لە ماڵی خۆیان دەربکەون و تەنانەت نەدەچووە ماڵی دراوسێکەشی، بەڵام ئەمڕۆ گەریلان و لە سەر لووتکەی چیاکانن. گوندیی و لادێییە کوردەکان جاران دەترسان و نەیاندەوێرا بەرامبەر بە شێخ و ئاغاکان دەمیان بکەنەوە، بەڵام ئەمڕۆ هەرچەندە هێشتا شۆڕش سەرکەوتنی بەدەست نەهێناوە، بەڵام زمانیان کراوەتەوە و هەست بە ئازادبوون دەکەن. لە ڕابردوو کەس گوێی لە دەنگی کوردان ڕانەدەگرت، بەڵام ئێستا دان بە هەبوونی ٣٠-٤٠ ملیۆن کورد دادەنرێ. ئەمڕۆ تەنانەت خاوەن تەلەفزیۆنیشە، لە ڕابردوو نەک هەر تەنیا تەلەفزیۆنی نەبوو، بەڵکو کەس نەیدەوێرا بە زمانی کوردی گۆرانیش بڵێ. هەروەکو بیرێک بە دەرزی لێبدرێت هەناسە بە هەناسە تەواوی ئەم کارانەمان کرد. ئیتر ئەمڕۆ گەلی کورد جێگای خۆی لە نێو جیهاندا گرتووە. ئەگەر ئەوە دیموکراسی نەبێ، ئەی دیموکراسی چییە؟ دیکتاتۆریەت و خۆسەپاندن و شتی تری دەیڵێن، لە درۆ و دژە پڕووپاگەندە بەملاوە شتێکی تر نییە. گەورەترین دیموکراسی ئەو تێکۆشانەیە کە ئەنجاممانداوە. ئەگەر نەتەوەیەکی بەمجۆرە هەڵسێنینەوە سەرپێیان و بەمجۆرە بیخوڵقێنین، ئەوە گەورەترین دیموکراسییە لە جیهان.

بە داخەوە لە ناو پەکەکە دا جگە لە ڕێبەرایەتی، کەسێکی تر نییە بۆچوون و هزرێکی هەبێ. منیش بەرامبەر بەم دۆخە شێت دەبم. توانای خۆگوزارشتکردنییان نییە و نازانێ قسە بکات. دوژمن لە چاوی داوە و چاوەکانی کوێر کردووە، لە گوێی داوە و گوێیەکانی کەڕکردووە. منیش ڕۆژانە هەزار چەقۆی لێدەدەم، دەمەوێ چاو و گوێکانیان بکەمەوە. تەنیا کار و خەباتی دیموکراسی ناکەم، بەڵکو لە هەمانکاتدا وەک شمشێرێکی دیموکراسی وام. ئەگەر یەکێک بخوازێ لەم مەسەلەیە تێبگات و لێی بکۆڵێتەوە و بیەوێ بزانێ ڕێبەرایەتی (ئاپۆ) چییە، پێی دەڵێم: "ڕێبەرایەتی ئاپۆ شمشێری دیموکراسییە". هەروەکو چۆن مەسعود بارزانی پێی گووتم: تۆ شمشێری دیمۆکلیتسی". هەربۆیە با دیمۆکلیتس بکەین بە دیموکراسی و بە شمشێری دیموکراسی بەسەریدا بچین.

خاڵێکی تری گرنگ ئەوەیە، ئەگەر ئەمڕۆ گەلی کورد کەوتبێتە قسەکردن و بووبێتە خاوەنی ئیرادە، ئەمە مەزنترین دیموکراسییە. ئەوانە گێلن، نازانن ببینن و بیربکەنەوە. ئەگەر هزر و بیرکردنەوە نەبێ، ئایا دیموکراسی دەبێت؟ ئەگەر سیاسەت نەبێت دیموکراسیش نابێت، چونکە سیاسەت بەبێ دیموکراسی نابێت. ئەگەر گەلێک بەبێ سیاسەت بهێڵدرێت، ئایا ئەوە دیموکراسییە؟ دیموکراسی ئیرادەی گەلە، ئیرادەی گەل هێزی سیاسییە. هەر لەو پێناوەدا سیاسەت پێویستە و بە جۆرێکی دیکە

نابێ. بۆ پەیڕەوکردنی سیاسەتیش بەدەستهێنانی سەرکەوتن پێویستە. کاتێ تەواوی ئەمانەش بە دیهات، ئەمە دیموکراسییە، چونکە لە پێناو گەلە.
جگە لە ئێمە پارت و ڕێکخراوی تریش لە کوردستان هەیە، ڕێزم بۆیان هەیە، بەڵام ئەوان نە دیموکراسی و نە ئەو کار و خەباتانەیان ئەنجام نەدا کە باسم کردن. دیموکراسی وەک بەرەنجامی گەورەترین تێکۆشان و خەبات هاتەئاراوە. ئەوانەی تا دوێنێ نەیاندەتوانی دوو قسە بکەن، ئەمڕۆ کردوومانن بە شۆڕشگێڕ، ئەمەش یەکێکە لە گەورەترین کار و خەباتەکانی شۆڕش. لەو شوێنەی کەس نەیدەوێرا بڵێ "کوردم"، هەموویانمان کرد بە وڵاتپارێز و نیشتیمانپەروەر، ئەمەش دیموکراسیەتێکی شکۆمەندە. شتێکی تریش هەیە، ئەویش ئەوەیە کە من دەخوازم هەڤاڵانم پێگەیەکی زیاتر و مەزنتر بگرن، بەڵام هەڤاڵانم دەڵێن: "ئێمە شایستەی نین"، منیش پێیان دەڵێم: "دەی هەڤاڵان، ئێوە مەزن بوون و تەمەنتان گەیشتە سی-چلساڵی، ئیدی دەتوانن ببنە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی"، بەڵام دەڵێن: "نەخێر". هەر لە پێناو هەڤاڵان نزیکەی هەزار پەرتووکم نووسیوە، دەڵێم بەڵکو زمان و گوێ و چاوەکانیان بکرێتەوە. وەلێ بێ زمانە و نازانێ قسە بکات، هەر لە بەر ئەوەشە هێندەی نەماوە بتەقم. هەرشتێکی لە دەستم بێ لە پێناو ڕۆشنکردنەوەی مرۆڤی کورد ئەنجامی دەدەم. تەنیا کوردان ڕۆشن ناکرێنەوە، بەڵکو تەواوی

جیهان سەبارەت بە پرسی کورد ڕۆشن دەکەینەوە، هەر بۆیە ئەم تێکۆشانەی ئێمە تەنیا کار و خەباتی ڕێبەرایەتی نییە، بەڵکو کار و خەباتی شمشێری دیموکراسییە. بەمجۆرە دەتوانین هەڵوەستە لەسەر پرسی دیموکراسی کوردان بکەین.
دیموکراسی لە کوردستاندا چییە؟ دیموکراسی لە کوردستاندا لە هەمانکاتدا زانستە. دەنگی دیموکراسیخوازەکانیش بەهێزە. دیموکراسیخوازە مەزنەکان شمشێرن. لە شۆڕشی فەڕەنسا و لە ئیسلامیەتیشدا بەمجۆرە بوو. دیموکراسی هەیە، بەڵام لە هەندێ حاڵەتدا شمشێریش دیموکراسیەتە. لەبەر هەندێ هۆکاری بێ بنەما، کەس نایەوێ لە ئەوەی تر تێبگات، ئەمە دیموکراسی نییە. لە کاتێکدا شەخسێک کار و خەباتی مەزن لە پێناو دیموکراسی دەکات، بە هەزاران کەسیش لەولاوە لە ژێر ناوی دیموکراسیی دیماگۆژیەت"زۆربلێی" پێشدەخەن. باسکردنی ئەمانەش بۆ کوردان زۆر گرنگە. پێویستە بە شێوەیەکی زیاتر هەڵوەستە لەسەر دیموکراسیی و دیماگۆژیەت بکەین. پێویستە ئەوانە لە یەکتری جیا بکرێنەوە کە بە ڕاستی دیموکراسیخوازن و ئەوانەی دیماگۆژیەت دەکەن، دەبێ دەمامک لەسەر ئەوانە هەڵدرێتەوە کە پەیڕەو لە دیموکراسیی ناکەن و دیماگۆژیەت دەکەن. لە پێناو تێگەیشتنێکی ڕاست و دروست بۆ ئەم پرسە، ئەمە پێویستە. من ئەوەندە بە پێویستی نابینم

که باسی بکەم، بەڵام ئەو کار و خەباتەی کردوومانن لە بەرچاوانن، گەورەترین کار و خەباتی دیموکراسییە، شمشێری دیموکراسییە.

**محەمەد ڕەسوڵ هاوار:** ڕادیۆ و تەلەفزیۆن و ڕۆژنامەکانی تورکیا ڕۆژانە پڕووپاگەندە دژی ئێوە دەکەن و دەڵێن: دەیانەوێ لە تورکیا جیا ببنەوە و دەوڵەتێکی سەربەخۆ دامەزرێنن. هەروەها هەندێ دەزگای میدیایی دژ بە گەلی کوردیش هەمان شت دەڵێنەوە. لەم ڕێیەوە دەیانەوێ دەوڵەتەکانی ناوچەش بترسێنن. بەمجۆرە ئێوە بە جوداخواز دادەنێن. وەڵامتان بۆ ئەمانە چییە؟

**عەبدوڵڵا ئۆجالان:** ئەو کار و خەباتەی لە سەرەتاوە تا ڕۆژی ئەمڕۆمان لە پێناو گەلی کورد و کوردستان کردوومانە بە ئامانجی ئازادی و سەربەخۆییە. ئەو کار و خەباتە لە پێناو پارچەکردن نییە. شتێکی بەمجۆرەمان نەگوتووە. بە پێچەوانەوە مەسەلەی ئازادی و سەربەخۆیی، مانای یەکێتی گەلانە. هەروەها ئەو مافانەی لە ڕۆژی ئەمڕۆماندا گەلی کورد لە تورکیا، ئێران، سوریا و ئێراقی داوا دەکات چییە؟ ئازادییە، مافی سیاسی، پەرەپێدان و گەشەپێدانی کۆمەڵگەیە. بەبێ دەستکاریی کردنی سنوورە سیاسیەکان ئێستاش دەکرێ ئەو مافانە بەدیبێن. گەلی تورک چەندە مافی هەیە، با هێندە مافەش بە کوردان بدرێ.

دەکرێ لە چوارچێوەی سنووورە سیاسیەکانیاندا بێ و پێویستی بە جیابوونەوە نییە. تەنانەت لەم قۆناخەدا ئێمەش گۆڕینی سنوورەکان لە جێی خۆیدا نابینین. بگرە ئەگەر دەرفەتیش هەبێ، نامانەوێ. چونکە زیانمان پێدەگەیەنێ. لە زۆر لایەنەوە لە بەرژەوەندی ئێمەدا نییە و سوودبەخش نابێ. لە هیچ هەلومەرجێکدا لایەنگریی گۆڕانکاریی سنوورەکان نین. تا ئەو کاتەی لە سوودی ئێمەدایە، دەتوانین بە یەکەوە لە چوارچێوەی هەمان سنووردا بمێنینەوە، دەتوانین بەرژەوەندیەکانی گەلی کورد و کوردستان بپارێزین.

بەڵام ئێستا ئەمەش پەسەند ناکەن، لە دۆخێکی وەهادا ئێمەش تا دوایی درێژە بە شەڕ و تێکۆشان دەدەین. لە بنەڕەتدا هەر ئەو دەوڵەتانە بوون گەلی کوردیان بەو ڕەوشە گەیاند. بۆیە بڕیارمان داوە ئەم کاروانە تا دوایی بەردەوام بێت. ئەم کارە بە سەپاندن نابێ؛ با برایەتی نێوان گەلان بسەلمێنن، ئەوکاتە بە یەکەوە دەژین، بۆ ئەمەشیان ئامادەین. بەڵام نە ئەمەیان لا پەسەندە نە ئەوەی تر. هەڵوێستی ئەمانە دوژمنایەتی کردنی بڕیاری گەلی کوردە. نەک پەکەکە، بەڵکو خودی گەل سەبارەت بە یەکێتی و سەربەخۆیی و یەکسانی بڕیار دەدات. ئێمە نامانەوێ لە بارەی پارچەکانی دیکەی کوردستان بڕیار بدەین. گەلی

کورد لە ناو سێ میللەتدا پارچە کراوە. ئێستا لە ناو نەتەوەکانی تورک و فارس و عەرەب دایە. ئێمەش دەمانەوێ فیدڕاسیۆنێک لە ناو ئەو سێ نەتەوەیەدا پێک بێنین؛ فیدڕاسیۆنی دیموکراتیانەی گەل.
ئەگەر فیدراسیۆنی کوردان لە ناو ئەو سێ دەوڵەتەدا پێک بهێنرێ، فیدراسیۆنی خۆرهەڵاتی ناوینیش پێکدێ. چونکە فیدراسیۆنی کوردستانی مانای فیدراسیۆنی خۆرهەڵاتی ناوینە؛ ئەوەش واتای یەکێتی گەلانی خۆرهەڵاتی ناوینە. لە ڕێگەی ئازادی و سەربەخۆییەوە گەلی کوردستان، گەلانی خۆرهەڵاتی ناوین پارچە ناکات، بە پێچەوانەوە دەیانکات بە یەک. ئازادی و سەربەخۆیی گەلی کوردستان ڕێنیشاندەری گەلانی خۆرهەڵاتی ناوینە و یەکێتی فەراهەم دەکات. هەربۆیە ئەم کار و خەباتانە گرنگن. سەبارەت بە ئازادی تەواوی گەلانی خۆرهەڵاتی ناوین یەکسانی بەدیدێت. هەربۆیە بانگەشە و ئیدیعاکانی جوداخوازی ڕاست نییە. ئێمە پارچەبوونمان ناوێ. ئەوان نایەکسانی نێوان گەلان و کۆیلایەتی دەسەپێنن. ئێمەش دژی ئەوەین.

## تێکۆشانی پەکەکە بەرامبەر بەو تیرۆرەیە کە دژی مرۆڤایەتی پیادە دەکرێ!

**محەمەد ڕەسوڵ هاوار:** تەلەفزیۆن و ڕادیۆ و ڕۆژنامەکانی تورکیا بەردەوام پەکەکە بە تیرۆریستی تاوانبار دەکەن. لە پێناو شاردنەوەی ئەو هۆڤێتی و دڕندایەتییەی ڕژێمی تورک دەیکات تەواوی کار و خەباتی پەکەکە بە تیرۆریزم ناو دەبات. میدیای تورک بە تایبەتی هەڵوەستە لە سەر دوو خاڵ دەکات: یەکەمیان، پێداگری لە سەر ئەوە دەکات کە پارتەکەتان و گەریلاکانتان لە باکووری کوردستان کردەوەی تیرۆریستی ئەنجامداوە، بەتایبەتیش بەرامبەر ئەوانەی لەگەڵتان هاوفیکر نین، هەروەها دەڵێن، لەو کردەوانەی بکەری نادیار کە لە کوردستان ڕوویانداوە، هەندێکیان لەلایەن ئێوەوە کراوە، دەیانەوێ ئەمانە بەسەر ئێوەدا ساغ بکەنەوە. دووەمیان، دەوڵەتی تورک لە ڕێگەی ڕاگەیاندنەوە باس لەوە دەکات کە هەندێ دەوڵەتی بیانی هاوکاری ماددیی و مەعنەویتان دەکەن و دژی تورکیا هانتان دەدەن. سەبارەت بەم دوو ئیدیعا و بانگەشەیە چی دەڵێن؟

**عەبدوڵڵا ئۆجالان:** ئەم پرسیارانەتان زۆر گرنگن. تەواو بە پێچەوانەوە، لە ڕۆژی ئەمڕۆماندا دەسەڵاتدارانی تورک و

کۆماری تورکیا گەورەترین تیرۆریزم پەیڕەو دەکەن. چەندین گەلیان لەناوبرد؟ گەلانی ئەرمەنی، ئاشوری و ڕۆمەکان و کولتوری هەزاران ساڵانەی ئەو گەلانەیان لەناوبرد. ئەشکەنجە تەنیا دژ بە گەلانی غەیرە تورک پیادە نەکراوە، بگرە بەرامبەر بە گەلی تورکیش پەیڕەو کراوە. ئەو ئەشکەنجەی بەرامبەر بە عەلەویەکان کردوویەتی، هاوتایەکی تری لە مێژوودا نابینرێ؛ هەزاران عەلەوی زیندەبەچاڵ کرد و کوشتنی. سەلجوقی و عوسمانی و کەمالیستەکان ئەمەیان کرد. هەرچی مستەفا کەماڵە نزیکترین هاوڕێی خۆی لە سێدارەدا. تیرۆریزم سەرچاوەی باڵادەستی و دەسەڵاتدارانی تورکە. تەواوی دونیا ئەم حەقیقەتە دەزانێ. هۆڤانەترین و دڕندانەترین تیرۆریزمی جیهان تیرۆریزمی دەسەڵاتدارانی تورکە. ئێستاش لە ڕێگەی تیرۆرەوە دەیانەوێ گەلی کورد لەناوببەن.

بەرخودان و خۆڕاگری پەکەکە کە بەرامبەر ئەم تیرۆرەی دەوڵەتی تورک وەستاوە، تیرۆریست نییە. بەڵکو تەواو بە پێچەوانەوە جیهادی موسڵمانان چەندە پیرۆز بێ، بەرخودانی ئێمەش لە پێناو گەلی کورد و تەواوی مرۆڤایەتی هێندە پیرۆزە. ئەگەر لێم بپرسن پیرۆزترین شەڕ و تێکۆشان کامەیانە؛ لە وەڵامدا دەڵێم، ئەو شەڕ و تێکۆشانەیە کە پەکەکە لە کوردستان بەڕێوەی دەبات؛ شەڕ و تێکۆشانێکی پاک و بێگەردە. شەڕێکە بەرامبەر بەو تیرۆرەی دژی تەواوی مرۆڤایەتی پەیڕەو دەکرێ. ئەو شەڕ

و تێکۆشانەی لە ژێر ڕێبەرایەتی پەکەکە بەڕێوەدەچێ، شەڕێکی پیرۆزی بەمجۆرەیە. تەنانەت پێویست ناکات هێندە باسیشی بکەین؛ سەیرێکی دوژمنەکەمان بکەن، دەستبەجێ لە ماهیەت و چۆنێتی شەڕ و تیکۆشانەکەمان تێدەگەن. گەلی کورد و شۆڕشگێڕەکانی ڕووبەڕووی کۆمەڵکوژی بوون. لە ڕێی ئەم شەڕ و تێکۆشانەوە ئەو کۆمەڵکوژیەمان وەستاند. زمانی ئەم گەلە بەسترابوو، کرایەوە؛ دەستەکانی بڕابوویەوە، لە میانەی ئەم تێکۆشانەوە دووبارە دروست کرایەوە. کاتێ گەل لە ژێر هەڕەشەی کۆمەڵکوژی دایە، چۆن دەتوانی بیوەستێنی؟ کێ ئەم تێکۆشانە بە تیرۆریزم دابنێ، ڕووڕەش و بێ شەرەفە. لەوانەیە لە زۆربەی شەڕەکاندا تیرۆریزم هەبێ، بەڵام لە شەڕ و تێکۆشانی پەکەکە دا نییە. هەڵبەت ڕژێمی تورکیا و ڕاگەیاندنە چەواشەکارەکەی دەیانەوێ ئەم شەڕە پیرۆزە وەک تیرۆریزم بە دونیا بناسێنن. بەڵام پێویستە دەرفەتی پێنەدرێ. ڕۆژ لە دوای ڕۆژیش دونیا باشتر تێدەگات کە کێ تیرۆرستێکی هۆڤ و دڕندەیە. لەبەر ئەوەی جیهان حەقیقەتەکە دەزانێ، هێندە گرنگی بە پڕووپاگەندە و بانگەشەکانی تورکیا نادات.

دووەمیان، دەتوانم بڵێم تاکە پارتێک لە دونیادا کە بە شێوەیەکی سەربەخۆ هەستاوەتە سەرپێیان و خۆی بەڕێوەدەبات پەکەکەیە. لە یەکەم ڕۆژی لەدایکبوونیەوە تا دەگاتە ڕۆژی ئەمڕۆمان بە یارمەتی و کۆمەکی گەلی کورد

هەنگاوی هاویشتووە. هیچ کەسێکی دیکە هاوکاری نەکردووە. لەوانەیە هەندێ دۆست وەک شەخس یارمەتییان دابین، بەڵام لەسەدا نەوەد و نۆی کۆمەک و هاوکاریەکان هی خودی گەلی کوردە. دەمانەوێ دەوڵەتان و گەلانی تر هاوکاریمان بکەن، بەڵام نایکەن. چونکە دەزانن کە ئێمە تا دوایی پێداگریی لەسەر ئازادی و سەربەخۆیی خۆمان دەکەین. سەربەخۆیی و ئازادی کوردانیش دۆستی کەمە؛ هەربۆیە یارمەتیمان نادەن. نە ڕووسیا و نە ئێران، هیچ یەکێکیان بۆ ئەمە ئامادە نین. ئەگەر بخوازن هاوکاریشمان بکەن ناتوانن. ئەگەر هاوکارییان بکردینایە، من پەسەندم دەکرد. بە هۆی بەرژەوەندیەکانیان نایانەوێ هەنگاوێکی بەمجۆرە بهاوێژن. بەڵام ئێمە هاوکاری و کۆمەکەکانی گەلی کوردمان مسۆگەر کرد؛ ئەمەشیان بۆ ئێمە بەسە و پێویستیمان بە هی کەسی تر نییە. ئێستا ڕۆژانە بە هەزاران کەس داوای یارمەتی و هاوکاری لە ئێمە دەکەن؛ لەو بڕوایەدام ڕۆژێک دێت تەنانەت ئەمریکاش داوای هاوکاری لە ئێمە بکات. ئێستا ئێران داوای هاوکاری لە ئێمە دەکات، لە داهاتوو لەوانەیە ڕووسیاش داوا بکات. ئێمە هاوکاری وەرناگرین، بەڵکو بە پێچەوانەوە یارمەتی خەڵکانی تر دەدەین. پەکەکە ئاڕاستەیەکی بەمجۆرە پەیڕەو دەکات.

## پەکەکە پارتێکی کوردستانی نیشتیمانپەروەرە

**محەمەد ڕەسوڵ هاوار:** پەڕینەوەی گەریلاکانتان لە باکووری کوردستان بۆ باشووری کوردستان بیانوویێک دەداتە دەست حکومەتی تورک. بەم بیانووەش ناو بە ناو سەربازەکانی خۆی دەنێرێتە باشووری کوردستان و ئۆپەراسیۆنی سەربازیی ئەنجام دەدات. ئەمەش دەبێتە هۆکاری چەندین کێشە و گیروگرفت بۆ حکومەتی فیدراڵی باشوور؛ لە پێناو پاراستنی حکومەتی فیدراڵ و نەهێشتنی بیانوو بە دەست دەوڵەتی تورکەوە، هەروەها بۆ ئەوەی وەک کارتێک بە دەستی بەکرێگیراوانەوە نەبێ، بە بۆچوونی ئێوە پێویستە چی بکرێ؟

**عەبدوڵڵا ئۆجالان:** بەر لە هەموو شتێک پێویستە لەو حەقیقەتە تێبگەین کە شۆڕشی کوردستانی مەزن، شۆڕشی باشووری کوردستانیشە. دووەمیان، دەسەڵاتدارانی باشوور لەو بڕوایەدان کە حکومەتێکی فیدراڵیان دامەزراندووە؛ بەڵام بە بڕوای من ئەگەر پەرەسەندنەکانی باکووری کوردستان نەبێ، با حکومەتی فیدراڵ لەولاوە بمێنێ، دوژمن تەواوی باشووری کوردستان دەکات بە هەڵەبجە؛ دووچاری کۆمەڵکوژی دەکات. ئەگەر ئەمڕۆ لە باشووری کوردستان کۆمەڵکوژی هاوشێوەی هەڵەبجە ڕوونادات، هۆکارەکەی پەرەسەندنی شۆڕشی کوردستانی مەزنە. پێویستە ئەم حەقیقەتە ببینرێ. خاڵێکی تریش

ئەوەیە، ئەگەر کار و خەباتی پەکەکە نەبێ، ئەو هێزانەی وابەستەی دوژمن نین نەیاندەتوانی کار و خەباتێکی نەتەوەیی- نیشتیمانی بکەن. نەیاندەتوانی لە پێگەیەکی نەتەوەیی و دیموکراتی دابن. هۆکاری ئەوەی تا ئێستا هێزە دەسەڵاتدارەکانی باشووری کوردستان نەیانتوانیوە سەرکەوتووبن، بۆ بەکرێگیراوی و هاوکاری کردنی دوژمنەکانیان دەگەڕێتەوە. ئێستاش کۆسپ و بەربەست لە پێش ئێمە دروست دەکەن. ئێمەش وەک بیانووێک پیشان دەدەن.

لێرەدا پێویستە هیچ کەسێک خۆی نەخەڵەتێنێ. پەکەکە پارتێکی کوردستانی نیشتیمانپەروەرە؛ پارتی دیموکراسییە؛ لە خزمەتی کوردان و کوردستان و دیموکراسی دایە. لە باکوور و باشوور بێ یان خۆرهەڵات و خۆرئاوا، ئەمە ئەرکی ئێمەیە. ئێمە لەگەڵ گەلی کوردین، دژ بە گەل نین. تا هێز و توانامان هەبێ لە خزمەت کردنی ئەم گەلە بەردەوام دەبین؛ جگە لەمەش ڕێگایەکی دیکەمان نییە. لە ساڵانی هەشتاکان کاتێ یەنەکە لەگەڵ ڕژێمی ئێراق کەوتە ناو دیالۆگەوە، دەزانن هەڵوێستی تورکیا چۆن بوو؟ لەجیاتی پشتگیریی، بۆچی دژایەتی کرد؟ ڕژێم لە هەڵەبجە کۆمەڵکوژی کرد، بۆچی دەوڵەتی تورک دەنگی لێوە نەهات؟ ئەگەر دوژمنەکەت هێندە گرنگی بە باشووری کوردستان دەدات، دەبێ تۆ چی بکەی؟ پێویستە ڕێککەوتن و هاوپەیمانێتییەکانت لەگەڵ دوژمن نەبێت، بەڵکو لەگەڵ

گەلەکەت و براکانت بێ. ئەگەر ڕێککەوتنەکانت لەگەڵ گەل و براکانت نەبێ، ئەوا چەندین کۆمەڵکوژی دیکەی هاوشێوەی هەڵەبجە ڕوودەدات.
ڕووی قسەم لە تەواوی هێز و پارتەکانی کوردستانە؛ پێویستە هەمووومان سەبارەت بەم بابەتە ئاقڵانە بیربکەینەوە و هەنگاو بهاوێژین. گوایە لەبەر ئەوەی پەکەکە لە باشووری کوردستانە، بۆیە سوپای تورکیا دەکەوێتە باشوور؛ ئەمانە هەمووی درۆ و دەلەسەن. بەر لە هەموو شتێک ئەمە گەل و نیشتیمانی ئێمەیە؛ خەڵکی باشووریش زۆرینەی کوردە و ئەو دەڤەرەش کوردستانە. ئێمە ناچارین لە ناو گەلی خۆماندا بین. ئەگەر بابەتەکە پرسێکی تاکتیکی بێت، ئەمە جیاوازترە و دەکرێ هەڵوەستەی لەسەر بکەین و هەنگاوی پێویست بهاوێژرێ. لەمیانەی هەڵوێستێکی تاکتیکیەوە دەکرێ سەبارەت بەم بابەتە گفتوگۆ بکەین و چارەسەری بدۆزینەوە. بەڵام خۆ بەستنەوە بە دوژمن و ڕێگری کردن لە فیدراسیۆنی باشوور و شۆڕشی باکووری کوردستان؛ لە پێناو پەردەپۆش کردنی ئەو کارانەش بیانوو بێنیەوە؛ ئەمە خیانەتە. ئەمە کرۆکی بابەتەکەیە.
کار و خەباتی ئێمە لە باکوور و باشووریش سیاسی و سەربازییە. تێکۆشانێکی کوردستانییە. لە هەمان کاتدا کار و خەباتێکی ڕۆشنکەرەوە و پەرەپێدانە. واتە کار و خەباتێک نییە کۆسپ دروست بکات، بەڵکو کار و خەباتێکە پرسە هەزاران ساڵیەکان چارەسەر دەکات. هەر کەسێکیش ئەم

حەقیقەتە دەزانی. سالانێکە ناکۆکی لە نێوان ئێمە و پەدەکە- ئێراق دا هەیە. دەکرێ ئەم ناکۆکیانە لە ڕێگەی سیاسی و سەربازی چارەسەر بکرێن. با فیدراسیۆن لە باشووری کوردستان پێکبێنن، دەستبەجێ خزمەتی دەکەین؛ ئەگەر بیانەوێ لە ڕووی مادیی و مەعنەویەوە هاوکارییان دەکەین. ئەگەر بڕیاری گەلی کورد و کۆنگرەی نیشتیمانی نەبێ، ئێمە ناتوانین لەوێ بمێنینەوە. چونکە ئێمە دەمانەوێ شۆڕشی کوردستانی مەزن بە سەرکەوتن بگەیەنین. هاوکاری کردن پێویستە، ئەرکی سەر شانمانە یارمەتی و هاوکارییان بکەین. ئەوانیش ناچارن هاوکاری شۆڕشی باکووری کوردستان بکەن. ئەگەر شۆڕشی باکووری کوردستان نەبێ، فیدراسیۆنی باشووری کوردستان تەنانەت بۆ ماوەی بیست و چوار کاتژمێریش ناتوانێ لەسەر پێیان بمێنێتەوە. ئەگەر دەتەوێ فیدراسیۆنی باشوور لەسەر پێیان بمێنێتەوە؛ هاوکاری شۆڕشی باکووری کوردستان دەکەی. ئەمە قوفلەکەیە؛ ئەم قوفلە نەکەیتەوە، شۆڕشی باشوور مانایەکی ئەوتۆی نابێ. ئەمەش بۆچوونی بنەڕەتی منە. ئەگەر ناکۆکیەکانی نێوان کوردان لە باکوور و باشووری کوردستان چارەسەر بکرێ، ئەوکاتە شۆڕشی کوردستان بە شێوەیەکی بەهێزتر بە سەرکەوتن دەگات.

**محەمەد ڕەسول هاوار:** هەروەکو لە پرسیارەکەی پێشووش باسمان کرد، هەندێک لە هێزەکانی خۆتان لە باکوورەوە بەرەو باشوور هێناوە، لە ماوەیەکی نزیک لێک تێگەیشتن لە

نێوان ئێوه و پەدەکە دا دێتە ئاراوە، ئایا ئەو هێزانەتان بۆ دەوڵەتی تورکیا نابێتە بیانوویەک؟ واتە ئەگەر دەوڵەتی تورک فشار بخاتە سەر پەدەکە، پەدەکەش دژ بە ئێوه هەندێ بڕیار وەردەگرێ. ئایا دۆخێکی بەمجۆرە لەلایەنی ئێوەشەوە چاوەڕوان ناکرێ؟

**عەبدوڵڵا ئۆجالان:** لێرەدا مەسەلەکە پەدەکە نییە، چونکە ئەو شەڕەمان لە گەوهەردا بەرامبەر پەدەکە نەبوو، بەڵکو شەڕێک بوو دژ بە تورکیا. پەدەکە چەندە لە خزمەتی دەوڵەتی تورک دایە، شەڕی ئێمەش بەو ڕادەیە، دژی ڕژێمی تورکیایە. چ لە باکوور بێ یان باشوور هیچ جیاوازیەکی نییە. واتە پرسەکە دەرکەوتن یان دەرنەکەوتنی پەکەکە نییە لە ناوچەکە؛ پەدەکە چل ساڵە پەیوەندی لەگەل دوژمنانی گەلی کوردەوە هەیە؛ ئەم پەیوەندیانە لە چوارچێوەی وابەستەییە. ئێستاش بەمجۆرە بەردەوامە. ئەفسەرانی تورک ڕۆژانە بڕیار دەدەن، ئەوانیش ئەو بڕیارانە جێبەجێ دەکەن. ئەمە دوژمنایەتییە، هەرگیز ئەمە پەسەند ناکەین. دەوڵەتی تورک، دوژمنێکی فاشیستە، بڕیاری کۆمەڵکوژی کوردان دەدات. ئەمەش تەنیا سەبارەت بە کوردانی باکووری کوردستان نییە، بەڵکو بڕیارەکانیان دەرهەق بە تەواوی کوردانە.

ئەگەر پەدەکە لە بڕیاری تورکەکان دوورکەوێتەوە، بە گوێرەی داواکاری ئەوان ڕەفتار نەکات و بەڕێوە نەچێ، ئەوکاتە ئێمە بۆ تاکە ڕۆژێکیش نامێنینەوە. گوایە پەدەکەش

پارتێکی کوردانە، ئەگەر وابێ، با بڕیارەکانی گەلی کورد و کۆنگرەی نیشتیمانی پەسەند بکات، ئەوکاتە بۆ تاکە ڕۆژێکیش لەوێ نامێنین. با پەدەکە گوێڕایەڵی بڕیاری گەلی کورد بێ سەبارەت بە فیدراسیۆنەوە، فیدراسیۆنێک پەسەند بکات کە تەواوی کوردان لە خۆوە بگرێ، بۆ تاکە ڕۆژێکیش درێژە بە شەڕ نادەین، دەستبەجێ شەڕ دەوەستێنین. ئەمە مەسەلەی نێوان پارتەکانە، تەنیا پرسێکی سەبارەت بە باکوور و باشووری کوردستان نییە، بەڵکو پرسێکی کوردستانییە. تەواوی کوردان پەیوەندیدار دەکات. با پەدەکە بێت و بەشداری کۆبوونەوە سیاسیەکان بکات؛ تا بەبێ مەرج شەڕ بووەستێنین. با بەشداری کۆبوونەوەکان بێ، ئەگەر کێشە و گیروگرفتی نێوان لایەنەکان هەبێ، با لەو کۆبوونەوانەدا چارەسەریان بکەین. تا ئەگەر پەدەکە خۆی لەمانە بدزێتەوە و هێرشمان بکاتە سەر، تا ئەوکاتەی گوێڕایەڵی بڕیارەکانی گەلی کورد دەبێ و بەشداری کۆبوونەوەکانی دەکات، ئێمەش لە دژی دەوەستینەوە و بەرخودان دەکەین.

مەسەلەکە کێشەی نێوان پەکەکە- پەدەکە نییە، بەڵکو کێشەی نێوان پەکەکە- تورکیایە. واتە کێشەکە بابەتی نێوان پەکەکە- پەدەکە نییە، بەڵکو پرسی کوردە. ئەم پرسە تەنیا پەکەکە و پەدەکە پەیوەندیدار ناکات، بەڵکو لە هەمانکاتدا تەواوی کوردان پەیوەندیدار دەکات. ئەم کێشەیە چۆن

چارەسەر دەبێ؟ لە ڕێگەی کۆبوونەوەی کوردانەوە، لە ڕێگەی کۆنگرەی نیشتیمانی کوردستانەوە چارەسەر دەبێ.

**محەمەد ڕەسوڵ هاوار:** ئێوە هەندێ جار لە ڕێگەی ڕۆژنامە و تەلەفزیۆن و ڕادیۆوە دەڵێن؛ سەرباز و جەندرمەکانی تورک جلوبەرگی پێشمەرگە دەپۆشن و لەگەڵ پەدەکە دژی ئێوە شەڕ دەکەن، هیچ بەڵگەیەکتان لەبەر دەستدا هەیە ئەم بانگێشەیەتان بسەلمێنێ؟ ئەگەر هەیە، بۆچی بۆ ئاشکراکردنی حەقیقەتی پەدەکە، بۆ ڕای گشتی بڵاوی ناکەنەوە؟ هەروەها لە کاتی شەڕ و پێکداداندا، لاشەی کوژراوانی سەربازی تورک دەکەوێتە دەست هەڤاڵانتان؟

**عەبدوڵلا ئۆجالان:** بەڵێ چەندین بەڵگە هەیە. لە ڕاستیدا هەر خۆیان دانی پێدادەنێن؛ بۆ نموونە، سامی عەبدولڕەحمان لە لێدوانێکیدا گووتوویەتی؛ "ئێمە هێزێکی بیست هەزار کەسی پێکدێنین، پارە و پۆشاکەکانیان لە لایەن تورکەکانەوە دابین دەکرێ". هەروەها دوێنێ هەواڵێکمان بۆ هات کە تورکیا چەک و تەقەمەنی (زرێپۆشیشی لە ناودا) زۆری پێداون. کۆبوونەوەی ڕۆژانەیان لەگەڵ ئەفسەرە تورکەکان هەیە. هەروەها پۆشاک و کۆڵەپشت و چەکەکانیان لە شەڕدا کەوتۆتە دەست هەڤاڵانمان، زۆربەی چەکەکانیان هی تورکیایە. دوێنێ تەرمی شەش لەوانەیان بردۆتەوە شاری جزیرەی باکووری کوردستان؛ جاش بوون. ئەمە دۆخێکی گشتییە، تورکیا بە هەموو جۆرێک یارمەتییان دەدات.

**محەمەد ڕەسو هاوار:** لە ئۆپەراسیۆنی چەلیک (پۆلا)دا ٣٥-٤٠ هەزار سەربازی تورک بە خۆی و چەکە دڕندەکانیان سنوریان بەزاند و کەوتنە ناو خاکی باشووری کوردستان و هێرش و پەلاماریان کردە سەر هێزەکانی گەریلا. دوای پاشەکشێی ئەو ئۆپەراسیۆنە، هەندێ وڵات سەبارەت بە سنوور بەزاندنەکەی تورکیا ناڕەزاییان دەربڕی. هەروەها هەڤاڵانیشتان بەرخودانێکی باشیان بەرامبەر بە سەربازانی تورک کرد. هەروەها دەڵێن، کاتێ سوپای تورکیا پاشەکشێی کردووە، هەندێ لە چەک و تەقەمەنیەکانی بۆ پەدەکە بەجێ هێشتووە تا دژی ئێوە شەڕ بکات، لەم بارەیەوە چی دەڵێن؟

**عەبدوڵلا ئۆجالان:** بەڵێ ئەوەی ئاماژەتان پێکرد ڕاستە، لە ئەنجامی بەرخودانێکی مێژوویی گەریلاکانمان، سوپای تورک بە ناچاری پاشەکشێی کرد. واتە پاشەکشێکەی بە هۆی ناڕەزایی و کاردانەوەکانی ئەوروپا نەبوو. ئۆپەراسیۆنەکە چل و پێنج ڕۆژ بەردەوام بوو، بانگەوازیەکەی ئەوروپا شتێکی ڕووالەتییە. ئەمریکا خۆی ڕێگەی بە سوپای تورک دا. دوای پاشەکشێ کردنیان، بانگەوازییان کرد. ئەگەر پاشەکشێیان نەکردایە، هەلومەرجی ئێمە باش و لە باربوو، دەمانتوانی گورزی قورستریشیان لێ بوەشێنین. هۆکاری سەرەکی پاشەکشێیان بەرخودانی هێزی گەریلایە. خۆی ڕۆیشت، بەڵام نوێنەرەکەی خۆی بەجێهێشت.

لێرەدا پێویستە سەرنجی ئەم خاڵە بدرێ؛ پەدەکە جێگای سەربازانی تورکی گرتەوە؛ چەکەکان هەمان ئەوانەی پێشوون، هاوکاری مادیش لەلایەن تورکەکانەوەیە. سوپای تورکیا بڕیار سەبارەت بە ئێمە وەردەگرێت، پەدەکەش جێبەجێی دەکات؛ ئەمەیان گرنگە. هەروەها چەندین ئەفسەری تورک لە زاخۆ و دهۆکن، خۆیان شەڕەکە ئاڕاستە دەکەن. تورکیا بە کەسانی وەک سامی عەبدولڕەحمان دەڵێ: "بگرە ئەمە چەک و پارە" و بەرەو شەڕ ئاڕاستەیان دەکات. چەکدارانی پەدەکە کۆدەکەنەوە و چەک و پارەیان پێدەدەن. ئەفسەرە تورکەکان مانگانە پارە بە چەکدارانی پەدەکە دەدەن. ئەمە چی دەسەلمێنێ؟ لە ڕاستیدا ئەمانە پێشمەرگە نین، ناوی پێشمەرگەیان لە خۆیان ناوە، بەڵام سەربازی تورکەکانن. تەنانەت ئەمانە چەکداری پەدەکەش نین، پەدەکەش ناتوانێ کۆنترۆڵیان بکات. تورکیا مووچەکانیان دەدات؛ ئەمانە سەربازی دەوڵەتی تورکن؛ تەنیا پۆشاکەکانیان هی پێشمەرگەیە.

## شۆڕش هەر شتێکی مرۆڤی کوردە

**محەمەد ڕەسوڵ هاوار:** وەک دەزانرێ ئێوەش لە کوردستان سەرۆکی پارتێکن، یەکێکن لە ڕێبەرانی کوردستان. ئەو شتانە چین کە ئێوە لە پێناو ماف و داواکانی گەلی کورد وێناتان کردووە و ئامانجتانە؟ لە داهاتوودا گەلی کورد دەتوانێ بە چی بگات؟ لە پێناو گەیشتنی گەلەکەمان بە ئامانجەکانی ئەو هەنگاوە بە پەلانە چین و کامانەن کە پێویستە بهاوێشترێ؟

**عەبدوڵلا ئۆجالان:** پێشتر دۆخی کوردستانمان تاوتوێ کرد، ئێستا شەڕ و تێکۆشان هەر شتێک یەکلایی دەکاتەوە. کاتێک شۆڕشی باکووری کوردستان بە چارەسەری بگات، پرسی کوردستان چارەسەر دەبێ. شۆڕشی باکووری کوردستان بە گوڕوتین بەردەوام بێ، تەواوی کوردستان لەسەر پێیان دەبێ. ئەگەر بووەستێ، ئەمە تەنیا نابێتە شکستی پەکەکە، بەڵکو دەبێتە تێکشکانی تەواوی گەلی کورد. کەسیش ناتوانێ نکوڵی لەو حەقیقەتە بکات. ئەگەر ئەم شۆڕشە لە باکوور هەنگاوێک بەرەو پێشەوە بچێ، کوردانی پارچەکانی تر، بە تایبەتیش باشوور دە هەنگاو بەرەو پێشەوە دەچن؛ باکووری کوردستان بە سەرکەوتن بگات، تەواوی کوردستان بە سەرکەوتن دەگات. شۆڕشی باکووری کوردستان کلیلی هەر شتێکە؛ کلیلی تەواوی کوردستانە؛ تەنیا کلیلی ڕۆژی ئەمڕۆمان نییە، بەڵکو کلیلی سەرتاپای مێژووە.

دەتەوێ ئاشنای مێژووی کوردستان و سروشتەکەی بیت، ئەمە شۆڕشە و بە شۆڕش دەکرێ. ئەگەر دەتەوێ لە باشووری کوردستان بمێنیتەوە و بژیت، پێویستە لە باکووری کوردستان ببیتە خاوەن ستاتۆ. ئەگەر مەبەستتە کاری باش بۆ تەواوی کوردستان بکەی، خزمەتی کوردستانی گەورە بکە. دەتەوێ پەیوەندی دیبلۆماسی لەگەڵ جیهان پەرە پێبدەی، دەبێ چاوت لەسەر باکووری کوردستان بێ. ئەگەر مەبەستتە کۆمەڵگەکەت پێک بێنی و لە بواری ئابووری گەشە بکەیت، چاوت لەسەر باکووری کوردستان بێ. مەبەستتە مرۆڤ و ژیانی نوێ بئافرێنی و دیموکراسی ئاوا بکەی دیسان سەیری کوردستانی گەورە و باکووری کوردستان بکە؛ چونکە باکووری کوردستان کلیلە. لەسەر ئەم بنەمایە شۆڕش بەڕێوە دەبەین. بەبێ ئەو، نە مێژوو و نە ژیان، هیچ یەکێکیان نابێ؛ ئەمڕۆشمان نابێ. بەبێ ئەو، نە ئابوری و سیاسەت، نە ڕۆح و کەسایەتی، هیچ یەکێکیان نامێنێ. هەربۆیە ئەم شۆڕشە بە زەمینەی هەر شتێک دادەنێم.

نەک تەنیا لە پێناو هەلومەرجەکانی ڕۆژی ئەمڕۆ؛ تەواوی کوردان و پارتەکانی کوردستان، تەنانەت گەلانی خۆرهەڵاتی ناوینیش لە زۆر ڕووەوە ئاییندەیان گرێدراوی ئەم شۆڕشەیە. نەمان و کۆتایی هاتنی فاشیزم لە تورکیا گرێدراوی هەنگاوەکانی شۆڕشەکەمانە. هەروەها بەڕێوەچوونی دیموکراسی بۆ گەلانی خۆرهەڵاتی ناوینیش، گرێدراوی شۆڕشەکەمانە. هەربۆیە گرنگیەکی زۆری

پێدەدەم؛ لەو پێناوەشدا بە گوڕوتینێکی مەزن کار و بارەکانی ڕادەپەڕێنم. ئامانج چەندە گەورە بێ، ئەوا مرۆڤیش بە هێز و توانایەکی گەورەتر بەشداری کار و خەبات دەبێ.
خاڵێکی تریش، چەند مەترێک ئەم خاکە بکۆڵیت بە گەنجینەکانی زێڕ و گەوهەر دەگەی، واتە وڵاتێکی دەوڵەمەند و پڕ لە خێر و بێرە. ئەمریکا و خۆرئاوا نایانەوێ کوردستان بە سەرکەوتن بگات، چونکە لای ئەوان زێڕ و سامان لە برایەتی لە پێشتر و گرنگترە. هەڤالانمان، گەریلاکانمان خۆیان فیدا دەکەن؛ هەندێکیان شەهید و هەندێکی تریش بریندار و کەمئەندام دەبن؛ چونکە ژیان تەنیا لەم شۆڕشەدا دەبینن؛ ئەمەش سەلمێنراوە. سەرباری سەرما و سۆڵ و تێنوێتی و برسێتی، بەڵام بەرخودانێکی سەرسوڕهێنەر دەکەن. ئەمەش ئافراندنی ژیان و مرۆڤی ئێمەیە. مەحاڵە، بەبێ ئەو ناتوانین لەسەر پێیان بمێنین. گەورەترین ئیرادەی مرۆڤ بەشداری شۆڕش بوونە. ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێ کە شۆڕش هەر شتێکی مرۆڤی کوردە. پرسیتان، ئایندەی کوردستان چۆن دەبینن؟ پەیوەست بەم شۆڕشەوە ئایندەی کوردستان پڕشنگدار و شکۆدار دەبینم. تا ئێستا مرۆڤی کورد لە دواوەی مرۆڤایەتی بوو، بەڵام لەو بڕوایەدام کە لەمە بە دواوە لە پێشەوەی مرۆڤایەتی دەبێ.
**ئیبراهیم ئەحمەد:** لەگەڵ بۆچوونەکانی سەرۆک ئاپۆ هاوڕام؛ باکووری کوردستان ئەو پارچەیە کە ڕۆڵی کلیل دەبینێ.

جاران دەیانگوت: "ئەگەر باکووری کوردستان هەستێتە سەرپێیان، کاریگەریەکی زۆر گەورەی دەبێ". بەڵێ ئەوەی ئەمڕۆ لە کوردستاندا لە ئارادایە ئەمەیە. باکووری کوردستان هەڵساوەتە سەر پێیان و پرسی کوردستانیش بە شێوەیەکی سەرتاسەری چارەسەر دەبێ.

**عەبدوڵلا ئۆجالان:** شۆڕشەکەمان تەنیا لە پێناو کوردستان نییە، بەڵکو بۆ تەواوی جیهانە. وەک چۆن سەردەمانێک شۆڕشی فەڕەنسا لە ئەورووپا بووە ڕێبەرێک، شۆڕشی ئۆکتۆبەر کاریگەری لەسەر ئاسیا و ئەفریقیا کرد و شۆڕشی ئیسلامیش جیهانی هەژاند، ئەم شۆڕشەش دەتوانێ کاریگەریەکی بەمجۆرەی هەبێ. دەرفەت و سەرچاوەی ئەمەش هەیە. وەک دەبینن ئەم قۆناخەش زۆر هەستیارە. چەند دەوڵەتێکی ئەورووپی زۆر هەستیارانە دەجوڵێنەوە؛ چونکە ئەم حەقیقەتە دەزانن. هەربۆیە نابێ و ناکرێ لە دیدگایەکی بەرتەسک و بە چاوێکی بچووکەوە سەیری شۆڕشی کوردستان بکرێ. لە کوردستان شۆڕش مەزن بووە، کەچی لای گەلان و ناوچەکانی دیکە کوژاوەتەوە و سارد بۆتەوە.

کێشە و پرسەکانی مرۆڤایەتی مەزنن؛ کێشە گەورەکانی مرۆڤایەتیش لە کوردستان لە ڕێگەی شۆڕشەوە وەڵام دەدرێتەوە. ئەگەر مەبەستتە مرۆڤایەتیەکی نوێ بئافرێنی، پێویستە هەڵوەستە لەسەر شۆڕشی کوردستان بکەی. ئەمڕۆ سروشت وێران کراوە؛ ئەگەر دەتەوێ وەڵامێکی ئەمە بدرێتەوە، لە شۆڕشی کوردستان ئەو وەڵامە

دەدۆزیتەوە. ئەمڕۆ مرۆڤ وەک مێروولەی لێهاتووە؛ ئەگەر دەتەوێ مرۆڤێکی نوێ و شکۆدار بئافرێنی، لە شۆڕشی کوردستان دەتوانی دەستەبەری بکەی؛ ئەمە حەقیقەتێکە نەک پڕوپاگەندە. شۆڕشی کوردستان شۆڕشێکی بەرتەسک و سنووردار نییە، بەرفراوانە و تەواوی مرۆڤایەتی لە خۆوە دەگرێ، شۆڕشی مرۆڤایەتییە. تێڕوانین و هەڵوێستی ئێمە بەمجۆرەیە. بە ناوی کورد و کوردایەتیەوە دەستمان بەم شۆڕشە نەکرد. یەکەم هەنگاو لە مرۆڤبوونەوە بوو، دواتر کوردبوون. ئەگەر کۆماریش دامەزرێنین، ئەو کۆمارە دەبێتە کۆماری مرۆڤایەتی، نەک تەنیا کورد و کوردستان.

مرۆڤایەتی لە میزۆپۆتامیا گەشەی سەند؛ بۆ یەکەمین جار دانەوێڵە لەسەر ئەم خاکە چێترا و ئاژەڵی تێداماڵیکرا. ئەمە حەقیقەتێکە، بناخەی مرۆڤایەتی لێرە، لەسەر ئەم خاکانە دانراوە. ئەمڕۆ مرۆڤایەتی بەرەو لەناوچوون دەچێ، بەڵام مرۆڤایەتی نوێ لە کوردستان پێک دێنین. وەک چۆن بناخەی مرۆڤایەتی لێرە دانراوە، دیسان لەسەر ئەم خاکانە دەتوانین ماف و ئازادی و ڕزگاریی مرۆڤایەتی بئافرێنین و بەدی بێنین. لە ناخەوە بڕوام بەم حەقیقەتە هەیە، بەڵام هەلومەرجیش لەبەر چاوانە، کۆشش و کار و خەباتی پێویستە.

## بەردەوام لایەنگری ڕێگەچارەی سیاسیین

**محەمەد ڕەسوڵ هاوار:** دوا پرسیارم گرنگترین پرسیارە، هەڵبەتە مەسەلەی "براکوژی" بابەتێکی ناپەسەندە. بۆچوونی گەلەکەمان سەبارەت بە بابەتی "براکوژی" چییە و چی دەڵێ؟ زۆربەی دەوڵەتانی جیهان و ئەوانەی دوژمنی گەلی کوردن، ئەم بابەتە وەک کارتێک بە دەستەوە دەگرن. دەیانەوێ ئەمە بۆ جیهان بسەلمێنن کە: "یەکێتی لە نێوان گەلی کورددا نییە و لەگەڵ یەکتری هەڵناکەن، ناتوانن خۆیان بەڕێوەببەن و بریتین لە چەند خێڵ و هۆزێک". ئایا لە هەلومەرجی ڕۆژی ئەمڕۆماندا ناکرێ ڕێگەچارەیەک بۆ ئەم دۆخە بدۆزرێتەوە؟ بەتایبەتی مەرجەکانتان چین؟ ئایا شتێکی تایبەت هەیە بەو کەسانەی بڵێی کە لە نێوان ئێوە و پەدەکە دا ناوبەینکاری دەکەن؟ سوپاستان دەکەم.

**عەبدوڵلا ئۆجالان:** دیسان دووبارەی دەکەمەوە، ئەو شەڕەی ئێستا لە ئارادایە من بە "براکوژی" ناوی نابەم. ئەمە شەڕێکە دژ بە دوژمنانی گەلی کوردە. خۆشتان لە مەسەلەکە تێگەیشتوون؛ سوپای تورکی فاشیست پاشەکشێی کرد، بەڵام بەشێکی چەکەکانی خۆیان دا بە چەکدارانی پەدەکە؛ تەنانەت مووچەشیان پێدەدەن. ئەمانە خاڵە سەرەکیەکانن. ئەمەی هەیە شەڕی "براکوژی" نییە. ئەم شەڕ و تێکۆشانەی گەلی کورد بەرامبەر بە

دوژمنەکانی دەیکات ڕۆڵێکی گەورە دەبینێ. تەواوی دونیاش بێتە لای یەکتر، ناتوانێ بسەلمێنێ کە ئەمە شەڕی "براکوژی" بێ. خیانەت هەر خیانەتە؛ ئەوەی لەگەڵ دوژمنی قڕکەر و خوێنمژی گەلی کورد ڕێککەوتن بکات، ناپاک و خیانەتکارە. ڕێککەوتن لەگەڵ ئەم دوژمنە مانای هێرش و دوژمنایەتی کردنی گەلی کوردە. مرۆڤ تا شوێنێک دەتوانێ مانا بە پەیوەندی بدات. بەڵام هاوکاری و ڕێککەوتن لەگەڵ دوژمنی فاشیست، هەڵوێستێکە دژ بە گەل، دوژمنایەتی کردنی گەلی کورد و کوردستانە.

دووەمیان، ئەگەر بیانەوێ هەنگاو بهاوێژن باشە؛ با مەسعود بارزانی بێت، لەو بارەیەوە هەرچیەک بڵێ ناتوانێ قەناعەتم پێ بێنێ. تۆ مووچە لە دوژمنی فاشیست وەردەگریت و هەموو جۆرە پەیوەندیەکت لەگەڵیدا هەیە. فاشیزمی تورک ناتوانێ مووچەی فەرمانبەرانی خۆی دابین بکات؛ لادێیی و کرێکاران لە ژێر بارێکی ناهەمواری هەژاری و برسێتی دان. ئەی بۆچی پارە بە جووتیار و کرێکارەکانی خۆی نادات، بە تۆی دەدات و تۆ لای ئەو لە پێشتری؟ هێندە کوردی خۆشدەوێ؟ خاڵی سەرەکی لێرەدایە؛ گوایە کوردی خۆشدەوێ، کورد لە باکووری کوردستانیش هەن، بۆچی شتێکیان پێنادات؟ ئایا تۆ بازرگانی بە خوێنی کوردان دەکەی؟ لەم ڕێیەوە گوزەران و بژێوی خۆت دابین دەکەی؟ بڕۆ بۆ خۆت کشتوکاڵ بکە، بازرگانی شتوومەک بکە؛ تەنانەت بازرگانی هەر چیەک

دەکەیت، بەڵام بازرگانی بە خوێنی مرۆڤی کورد مەکە. ناکرێ بازرگانی بە کچان و کوڕان و شەهیدانی کوردستانەوە بکرێ. ئەوەی شتێکی وەها خراپ پەسەند بکات، لە مرۆڤبوون و مرۆڤایەتی دەرکەوتووە. ئەمە ڕووڕەشیەکی مەزنە. داماویی و پەرێشانی کورد لێرەدایە. دەمانەوێ ئەمانە بزاندرێ و هەرکەس لێی تێبگات. ئەگەر لەگەڵ تورکە فاشیستەکان یەک نەبووایە؛ ئەم خیانەتەی نەکردبووایە و لەسەر ڕێگەی نیشتیمانپەروەری بووایە، ئەوا ئێمەش لە خزمەتی بنەماڵەی مەلا مستەفادا دەبووین. با دەستبەرداری تورکە فاشیستەکان بن، سبەینێ دەستبەجێ شەڕ دەوەستێنین. برۆ پێی بڵێ: "ئەگەر لە پێناو نیشتیمانپەروەری بێ، ئاپۆ دەبێ بە سەربازت، با خۆیان بۆ ئەمە ئامادە بکەن". شتێکیشم ناوێ؛ بە دڵنیاییەوە هیچ شتێکم ناوێ. وەڵامێکم بۆ بێنەوە، ڕۆژی دواتر شەڕ دەوەستێنین. من ئامادەکاری خۆم و هەڤاڵانم تەواو دەکەم و لە خزمەتی باشووری کوردستاندا دەبین. با بەیەکەوە لە بەرامبەر دوژمنانی گەلی کوردستان شەڕ بکەین. ئیتر بە هیچ جۆرێک ڕووی تفەنگەکانمان لە یەکتر نابێ. لە پێناو فیدراسیۆن هاوکار دەبین. دەوڵەتی تورک دوژمنی گەلی کوردە و بۆ هەموومان وەکو یەکە. بەڵام مەسعود بارزانی دەڵێ: "مادام تورکەکان پەنجە بۆ من ناهێنن، چی لە کوردان دەکەن با بیکەن. ئەمە مانای چییە؟ وەک ئەوە وایە؛ پیاوێک هەموو شەوێک بێ سەرجێیی لەگەڵ دایکی یەکێک بکات،

کوڕەش بڵێ مادام پەنجەم بۆ درێژ ناکات، ئەم کابرایە پیاوێکی باشە.
بەڵێ با دەستبەرداری ئەمە بێت. با ئەم پیاوە بێ ناموسە لەماڵەکەی خۆی دەربکات. ئەو ساتەی دەستبەرداری ئەم دووڕوویییە بوو، من شەڕ دەوەستێنم. بۆچی سەرکردایەتی پەدەکە لەمانە تێناگات. ئەوەی ئێمە دەمانەوێ دوو وشەیە.
کە وەڵامی دایەوە؛ تەنانەت ئەمڕۆش دەتوانین شەڕ بووەستێنین. بۆچی تێناگات؟ دەتوانین بازرگانی و کشتوکاڵیشی بۆ بکەین. دەتوانین تێر پارەشیان بکەین. ئەمانە داواکاریەکانی ئێمەن. ئەگەر پەسەندی نەکات، وەک ڕۆژی ڕووناک دیارە کە سەد لە سەد لە ژێر کۆنترۆڵی ئەفسەر و جەنراڵە تورکەکاندا دەبێ. پێویستە خۆی نەخاتە ناو دۆخێکی بەمجۆرەوە. با چیتر زارۆکێتی نەکات. ئێمە هێندە کار و خەبات دەکەین، ئەو هەموو شەهیدەمان داوە، هەوڵ و کۆششێکی زۆرمان داوە. بەراورد لەگەڵ ئەمانە مەسعود بارزانی هیچ شتێک نییە. ناتوانێ بڵێ، پەیوەندی لەگەڵ تورکە فاشیستەکان لە بەرژەوەندیمان دایە.
با پەیوەندیەکانی خۆی لەگەڵ تورکیا زۆر بەباشی هەڵسەنگێنێت. ناڵێین بەهیچ جۆرێک نابێ پەیوەندی هەبێ. با پەیوەندی هەبێ، بەڵام لەسەر حیسابی کەسی تر نەبێ. منیش دەمەوێ پەیوەندی سیاسی پەرە پێبدەم، بەڵام لەسەر حیسابی لایەنێکی تر ئەمە ناکەم. ئێمەش دەمانەوێ پرسی کورد چارەسەر بکەین. ئەگەر بە یەکەوە ڕێککەوتنمان

بکردایە، پەرەسەندنی مەزن لە باکووری کوردستان بەدیدەهات. هەروەکو پێشتر گووتمان، پەرەسەندنەکانی باکوور، پەرەسەندنی باشوورە؛ ئەوکاتە خۆی دەبوو بە دەسەلات. ئەمەیە پرسی کورد، پێویستە چارەسەر بکرێ. ئەویش ئاگاداری ئەم پرسانەیە، بەلام کاتێک لای لێ ناکاتەوە، چەک دەکەوێتە گەڕ. ئێمە بەردەوام لایەنگری ڕێگەچارەی سیاسین؛ بەلام ئەگەر هیچ ڕێگەیەک نەمێنێ، ئەوکاتە ناچارین بەرگریی لە خۆمان بکەین. تەنیا دوو مەرجمان هەیە: یەکەمیان، تورکە فاشیستەکان کۆمەلکوژیەکانیان بوەستێنن. دووەمیان، پرسی کورد بوونی هەیە، برایەتی واقیعێکە، پرسەکان لە ڕێی دیالۆگ و گفتوگۆ چارەسەر بکرێن.
ئەگەر شتێکی تر بلێن ئامادەین. وابزانم وەلامی پرسیارەکانتان وەرگرت.
**محەمەد ڕەسوڵ هاوار:** وەلامەکانی سەرۆک هەمووی ڕاستن و لە جێی خۆی دایە، ڕۆشنکەرەوە بوون. ئامانجی ئێمەش ئەوەیە ڕاستیەکان بە گەل بگەیەنین تا بە باشی ڕێبەرایەتی بناسن و حەقیقەت ببینن، بەمجۆرەش ناکۆکیەکانی مێشکیان چارەسەر بێ و نەمێنێ.
**عەبدوللا ئۆجالان:** ڕاستە، منیش ئەو خالانەم لە پێناو گەل باس کرد، تا حەقیقەت و ڕاستیەکان وەک خۆی بزانن. بە تایبەتیش مەبەستم کەسانی کەللەڕەقە، تا ڕۆشن ببنەوە، هیچ پرسیارێکی دیکەتان هەیە؟

**محەمەد ڕەسوڵ هاوار:** هیچ پرسیارێکی دیکەم نییە، چونکە بیر و بۆچوونەکانی سەرۆک نەک تەنیا هزر، بەڵکو خەیاڵەکانیشم بەدی دێنێت. سوپاستان دەکەم.

**عەبدوڵلا ئۆجالان:** خاڵتان بۆ بابەتەکە دانا. ئەمە تەنیا بیر و بۆچوونی ئێمە نییە، بەڵکو ئێوە ئیلهامتان پێ بەخشین. ئەو کارەی چل ساڵ بەر لە ئێستا لەسەر بنەمایەکی نیشتیمانپەروەری دەستتان پێکرد، کاری ئێمەیە. واتە دەبێتە خاوەنی ڕۆحیەتێک، سوپاس.

**ئیبراهیم ئەحمەد:** هەڤالانی هێژا پڕ بە دڵ لەگەڵتانم. خۆزگەم دەخواست لە تەمەنی ئێوەدا بوومایە؛ بەشداریم لە خولی پەروەردەیی ئەکادیمیاکەتاندا کردبووایە؛ وانەگەلێکم بۆ دەگووتنەوە سەبارەت بە تێکۆشان، نیشتیمانپەروەریی و خزمەتکردنی زیاتری گەلی کوردستان. پەنجا- شەست ساڵ بەر لە ئێستا قسەیەکم کردبوو، ئەوکاتە گووتبووم: "مەژی بۆ مردن، بمرە بۆ ژیان، چۆن قازانج دەکەی تا نەکەی زیان". بەڵام بە داخەوە کاتی خۆی کەسێکی هۆشمەند و تێگەیشتووی بەمجۆرە لەناو سەرکردایەتی ئێمەدا نەبوو، تا وەک سەرۆکی ئێوە حەقیقەتەکانمان تێبگەیەنێ. کەسێک نەبوو ڕۆح بەبەر دروشمەکانماندا بکات، لە ژیانی کۆن ڕزگارمان بکات و ڕێگەی ژیانی نوێمان پیشان بدات. کەس نەبوو ڕێگەمان پیشان بدات کە پێویستە مردن لە پێناو ژیان بێ، لە پێناو ژیانێکی ڕاست بێ. کەس نەبوو فێرمان بکات بەرخودان بکەین و کارەکانمان ڕاپەڕێنین. هەروەها کەس نەبوو سەبارەت بە ژیانێکی ئازاد وانەمان پێ بدات.

بینینتان و بەشداری کردن لە کۆبوونەوەکەتان زۆر دڵخۆشیان کردم. لەو بڕوایەدام کە لە کوردستانێکی ئازاد، کوردستانێکی فیدراڵ و دیموکراتدا بە یەکەوە بە ئاسوودەیی دەژین. هیوای سەرکەوتن بۆ ئێوە، بۆ پەکەکە و کار و خەباتە کوردستانیەکەی دەخوازم. هەروەها هیوای سەرکەوتن بۆ بزووتنەوە دیموکراسیخواز و نیشتیمانیەکانی دیکەش دەخوازم، هیوای سەرکەوتنتان بۆ دەخوازم. سوپاس بۆ هەمووتان.

**عەبدوڵلا ئۆجالان:** منیش سڵاو و ڕێزی خۆم پێشکەش مامۆستایان ئیبراهیم ئەحمەد و محەمەد ڕەسوڵ هاوار دەکەم.

**محەمەد ڕەسوڵ هاوار:** منیش هەمان هیوای مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەدتان بۆ دەخوازم. منیش شاعیرێکی تەمەن پەتجا سالیم، چەندین ساڵە هەڵبەست بۆ قوتابی و خوێندکاران دەنووسم. لە کاتێکدا داوای سەربەخۆیی گەلی کوردستان لە ئێوە دەخوازم، هیوای سەرکەوتنتان بۆ دەخوازم. ئێمە سەرکەوتن لە ئێوەدا دەبینین. ئێوەن هیوا و ئومێدمانن. سەرکەوتن لە ژێر ڕێبەرایەتی برای هێژام سەرۆک ئاپۆدا دەبێت.

**عەبدوڵلا ئۆجالان:** مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد و هەلبەستڤان هاوار هێزیان پێ بەخشین. دەمەوێ چەند ڕستەیەکی کۆتایی بڵێم. منیش سەرەتا کە دەستم بۆ ئەم کارە برد دەمگووت: "دەمرم، بەڵام لە خۆڕا نامرم، لە پێناو ژیانێکی سەربەرز و شەڕەفمەندانە، لە پێناو ئازادی کوردستان".

ئێستا مردنی کوردان لە پێناو ژیانێکی سەربەرزیی و شەڕەفمەندانەیە. ئەمەش شتێکی مەزن و شکۆدارە. کاتێ ئەم گووتەیەم لە مامۆستا بیست، شتێک سەرنجی ڕاکێشام؛ سەردەمی مندالّی من چۆنە، هی ئەویش بە هەمان شێوەیە. لێرە نیشتیمانپەروەری کورد بە یەکتر گەیشت؛ باکوور و باشوور بە یەکتر گەیشتن. لێرە هەڵوەستەمان لەسەر تەواوی ئەمانە کرد. لێرەدا یەکێتی کوردان و یەکێتی جولانەوەی نیشتیمانی کورد و کوردستان دەبینین. زۆر دڵخۆشم، هاتنتان بۆ ئێرە بۆ کار و خەباتی پەکەکەش هەنگاوێکی مەزنە؛ هیوا و ئومێدێکی مەزنمان پێ دەبەخشێ. لەو بڕوایەدام ئەو کار و خەباتەی تا ئێستا کردووتانە بە کۆنگرەی نیشتیمانی کوردستان تاجدار دەبێ. مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد دەتوانێ کۆنگرەی نیشتیمانی ڕابگەیەنێ، پشتگیریی لێدەکەم. بۆ کار و خەباتی کۆنگرەی نیشتیمانی ئامادەین هەموو جۆرە هاوکاریی و پشتگیریەکتان بکەین. لە ڕابردوو کار و خەباتی زۆر کرا، وەلێ ئەنجامگیر نەبوو. بەلاّم ئێستا سەرکەوتن لەم کار و خەباتانەدا دەبینم، لێک نزیک بوونەوە لە کار و خەباتی تەواوی پارچەکانی کوردستاندا دەبینم. جەژنتان پیرۆز بێ، هیوای بەختەوەریی و تەندورستیەکی باشتان بۆ دەخوازم.

**5-12-1995**

دەوڵەتی تورک تەنیا دوژمنایەتی کوردەکانی باکووری کوردستان ناکات، بەڵکو دوژمنایەتی کوردانی تەواوی پارچەکانی کوردستان دەکات. لە ڕاستیدا کۆماری تورکیا دوژمنی سەرەکی کوردانە. هەر بۆیە پێویستە هەر کوردێکی ڕەسەن، ڕاستەقینە و نیشتیمانپەروەر ئەو حەقیقەتە تێبگات و بزانێ، ئەگەر کوردەکانی باکووری کوردستان مافەکانیان بە دەست نەهێنن، تەنانەت لە هەر پارچەیەکی تری کوردستان دەوڵەتێکی سەربەخۆش دابمەزرێ و هەموو جیهان پشتگیریی لێ بکات، ئەگەر پرسی کورد لە باکووری کوردستان چارەسەر نەبێت، ئەوا ئەو دەوڵەتە سەربەخۆیەی کە دادەمەزرێ مسۆگەر دەڕووخێ.

**ئیبراهیم ئەحمەد**